رۆمان

# سنووورداشێك

# له بیاباني ئه‌نفالكراوانه‌وه



سه‌دره‌دین محێدین كه‌ڵوپیی



چاپی دووه‌م
2022

# سنووورداشێک لە بیابانی ئەنفالکراوانەوە

ڕۆمـــان

سەدرەدین محێدین کەڵۆپیی

چاپی دووەم
٢٠٢٢

## ناسنامەی کتێب:


- ناوی کتێب/ سنووورداشێك لە بیابانی ئەنفالکراوانەوە**٠
- بابەت/ ڕۆمان
- نووسینی/ سەدرەدین محێدین کەڵوڕیی
- شوێنی چاپ/ چاپخانەی گەنج
- ساڵی چاپ/ ٢٠٢٢
- نۆبەتی چاپ/ چاپی دووەم
- نرخ (٥٠٠٠)دینار

ژمارەی سپاردن (١٣٤)ی ساڵی ٢٠٠٦ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

ئێوارەیەکی بەهار بوو، ئەو ڕووبارەی بە پێش ما ڵمان تێپـەڕدەبوو، ئاویٚ سازگاری لە خۆگرتبوو، شەپۆلەکانی لەگەڵ تیشکی سووری خۆراوا بوون، دەسلەملانێی یەکدیبوون، باخیٚ پڕ لە گوڵە هێرۆ، بـەیبون و گوڵـەباخ، داری سـنەوبەر وچـناری بـەژن بـەرز، کـەناری ڕووبارەکـەیان ڕازانبـوەوە، ئـەو دەڤـەرە ببـووە جـوانترین جێـژوانی کوڕان و کچان، دوو دوو لە سەر کورسی باخەکە دانیشتبوون و بە هێمنی گفتوگۆیان دەکرد، جاروبار کە زمان دەوەستا بە تامـەزرۆوە دەیانڕوانییە سـەراپای یەکـدی، تـەزووی خۆشەویسـتییان بـە شـا دەمارەکـانی جەسـتە تێپـەڕدەبوو، خـوێنی گەشـیان، ئـاڵودەی ئـەو ئیشـقە پاکوبێگـەردە ببـوو، هـەبوون دەسـتیان لـەنێو دەسـتی یەکـدیبوو، بـە ڕێڕەوەکـان، بـە هێمنـی هـەنگاویان دەنـا، هـەموو خۆشـی ژینیـان لـە تێکـەڵی دەسـتی لـەرزۆك و گوشـینی پەنجـە ناسکەکانیان دەبینییەوە، کۆترە باریکە لەم چڵ بۆ ئەو چڵ دەفڕی، ئاوازی خۆشیان بۆ یەکدی دەچڕی، کەناری، ماچی ئەفسوناوییان دەگۆڕییـەوە، تیشـکی سـووریی خـۆزاوا بـوون، کەشـیٚ ڕۆمانسـی بەخشیبووە جێژوانی ئاشقان.

ئەو کەشە دڵڕفێنە، جێژوانی هەرزەکاریی هێنایەوە یادم ، حەزم دەکرد بانگی (نازە) بکەم ولە بینینی ئەم ئێوارە بەهارەی نەکەم، لە دووەمین نهۆمی خانوەکەمانەوە، سەیری خوارەوەم کرد، (سۆز و رۆز) لە نێو باخەکە یارییان دەکرد، بەڵام نازە دیار نەبوو ، گوتم ڕۆز گیان بانگی دایە بکە بێ بۆ سەربان.بە دەنگە ناسك و زولاڵەکەی بە دایکی گوت بگاتە سەربان.

لە چاوەڕوانیی (نازە) بووم، گوێم لە دەنگی پێی بوو بە سەر پلیکانەکان بەرەو سەربان دەهات ، وتم نازە گیان پەلە بکە و بگەرە سەربان، پەلەی کرد و خۆی گەیاندە سەربان، وتی چییبووە سامان گیان؟!هیچم بۆ نەگوترا، وامدەزانی یەکەمجاری جێژوانمانە ، زۆر بە تامەزرۆوە دەمڕوانییە (نازە)، بالاٌبەرز ونەشمیلانە، کوڵمەکانی بە تیشکی سووری خۆراوا بوون جوانتر ببوون، پرسیاری کردەوە گوتی سامان گیان چییبووە، بۆ وا تەماشام دەکەی؟!

– نازە گیان، یەکەمجاری جێژوان، دێتەوە یادت؟

زەردەخەنەیەکی کرد، بە نازێکەوە گوتی ئەی چۆن!!

– کەواتە سەرنجی کەناری ڕووبارەکە بدە، بۆ ئەو دیمەنە دڵفرێنە بانگم کردی، تەماشای دیمەنی خۆراوا بوون بکە، چۆن لەگەڵ شەپۆلی رووبارەکە یەکدییان گرتووە، کەشێکی ڕۆمانسییان بۆ ئاشقانی کەنار رووبارەکە ڕازاندوەتەوە، بە چاوە مەستەکانی تەماشایەکی کرد، گوتی:

سامان گیان بە ڕاستی وایە.

– نازە گیان دیمەنێکی زۆر دڵگیرە، وا نییە؟
– خۆت وتەنی، بە ڕاستی کەشێکی ڕۆمانسییە، زۆر دڵگیرو جوانە!
– وابێت ، ماچێکی ئەو کوڵمە سورانەت قەرزاری.
بە خەندەیەکی پڕلە ناز وشەرمەوە، وتی، لێرە چۆن دەبیٚ، خەڵکی دەمانبینن.
لە سەر کورسییەکەم دانیشتم ، گوتم :
خۆ ئێستە خەڵکی نامانبینن، دڵم مەشکێنە ماچێکم پێبەخشەو قەرزەکەت بدەرەوە.
قژە خاوەکەی، بە تیشکی سووری نزیك خۆراوابوون، ڕەنگێکی مۆری زۆرجوانی لە خۆگرتبوو، بە سەر لایێ ڕوویدا هاتبووە خوارەوە، بە پەنجەی سپیی وناسکی لایبرد، ڕووی مانگ ئاسای پتر دەرکەوت، لێم نزیکبووەوە، بە خۆشەویستییەکی پاکوبێگەردەوە ، بە هێمنی گوتی هەستە، توخوا هەستە با بچینە خوارەوە، خەڵکی دەمانبینن، بەڵام من هەر سوور بووم لە سەر داواکەم، ئەمجارەیان گرتی بە قۆڵم و بە گاڵتە و پێکەنینەوە، بە دڵێکی پڕلە خۆشی و ئاسوودەوە، گوتی:
هەستە ، سامان گیان هەستە.
نەمتوانی دڵی بشکێنم، چاوەکانم کردەوە، دەستی نازە لە سەر قۆڵم بوو، ڕایەتڵەکانم، کە بە تەواوی بە ئاگا هاتم، لە ژووریٚ لە قوڕ دروستکراو خۆم بینییەوە، چەندینجار دیرەگی بنمیچەکەم ئەژمار کردبوو، سیازدە دیرەگ بوو، تەنانەت تێیدا کرێچی بووم ،

هەناسەیێ سەردم هەڵکێشا، گوتم خۆزگە (نازە) لەو خەوە خۆشەت نەدەکردم، خەونێکم دەبینی، خۆشترین خەون بوو.

– چیببکەم سامان، دەردی هەژاریی زۆر ناخۆش وگرانە، گەر ئیمڕۆ نەگەیتە مەیدانی کرێکاران وکارت دەستنەکەوێ، ئەوا دەبێ ئێواریێ (نان نەخۆین!!).

لەگەڵ نانخواردن باسی خەونەکەم بۆ نازە کرد، ئەویش هەناسەیێ نائومێدی هەڵکێشا گوتی:

تۆ بڵێی سامان گیان، ڕۆژێ بێ و ببینە خاوەنی هەموو شتێ، خەونەکەت بێتە دی؟

ئاورێکم لە(ڕۆز، سۆز ) دایەوە کە چۆن دەستە خنجیلانەکانیان لە ملی یەکدی کردبوو، ویستم ماچیان بکەم، بەڵام پەشیمانبوومەوە، گوتم با لە خەویان نەکەم، نەك لە بینینی خەونێکی زۆر خۆشابن، سەرنجێکی (نازە)مدا گوتم نازە گیان خوا کەریمە.

# مەیدانی کرێکاران

هێشتا شەو مالآوایی نەکردبوو، ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە، مانگە شەو، وەك شای جوانان ڕووناکی دەبەخشی بە تاریکی شەو، لەو ساتە، مالآواییم لە نازە کرد و توورەکەکەی هاوڕێم دا بە چکشانم و بەرەو مەیدانی کرێکاران ڕۆیشتم.
ئەو ڕۆژە زۆر چاوەڕوانبووم، وەك زۆربەی ڕۆژانی دی، بۆ ڕۆژە کرێکاریێ، شۆستە وتەنانەت شەقامەکان لەبەر جەنجاڵی هەژاریی ڕەش و ڕووت گیرابوون، ئۆتۆمبیل بە ئاسانی نەیدەتوانی تێپەڕبێ.
هەر وەستاییێ، ڕووی بکردایە مەیدانەکە، دەیان کەس لێی کۆدەبوونەوە، بە ئارەزووی خۆی چەند کەسێکی هەڵدەبژارد، بە پێی خزمایەتیی، ناسیاویی یا شان و بازووی بە هێز، ئەوانی دی، ئیرەییان بەوانە دەبرد کە کاریان دەسکەوتووە، جا چ کاریێ، تا ئێواریێ خوێنیان دەمژیت، ئێواریێ چەند کاتژمێریێ پتر کاری پێدەکردی، دەبوایە بتکردایە، چونکە بۆ ڕۆژانی داهاتوو سوودی دەبوو، تا وەستای بێویژدان و خوێنمژ لەگەڵ خۆی بتیبردایەوە.
چاوەڕوانی تەواو دڵی تەنگکردم، هەردوو جگەر گۆشەکەم دەهاتنە

پێشچاو، داوایان لێدەکردم ڕۆژە کرێکارییێکم دەستکەوێ، تا ژەمێ خواردنیان شیرین و چەوربێ.

ئەو منداڵە هەست ناسك وپاکوبێگەردانە، زۆر دوورکەوتبوونەوە، لە جیهانی منداڵێتیی، چاویان لەوە نەبوو، بووکەڵەیەك، بازنێ، ئەنوستیلە و ملوانکێ یا جلوبەرگێ جوان بکەمە دیاری بۆیان، هەستونەستی ناسکیان لای پارەوە نانێ بوو.

زۆرجار بیرم لەوە دەکردەوە، بۆ ئەم منداڵانەم هێنایە ئەم دونیایەوە، بە ڕاستی هەڵە بوو، هەڵەیێ گەورە بوو کردم.

لە چاوەڕوانی و بیرکردنەوە، قورگم پڕ گریانبوو، حەزم دەکرد کەمێ بگریم، لە پڕ یەکێ بانگیکردم ، هەستێ باشم ڕاگرت، چاوم لە شوێنی دەنگەکە گێڕا، باوەڕم نەدەکرد بانگەکە بۆ من بێ، هەر خۆم دەمگوت چی زۆرە سامان ناو زۆرە، دووبارە بانگکرامەوە، (وریا)ی هاوڕێم دەرکەوت، بە ڕاستی کە دەمبینی، دڵتەنگی و ناخۆشی کەمێ یەخەیان بەردەدام.

– بەیانیت باش، سامان گیان چۆنی، کارت دەسنەکەوت؟

– ژیانت باش، بەڵام دەبێ چۆن بم، کەی ئەمە ژیانە، ئەو هەموو ساڵە خوێندمان و بڕوانامەی باشمان بە دەسهێنا، کەچی ئێستە چاوەڕوانین وەستایێ نەخوێنەوار، تەنیا بە پەنجەی هێمایەکمان بۆ بکات و بکەوینە دوای بۆ ڕۆژە کرێکاریی، پاش خوێنمژین، دەبێ مەمنونی بین .

- خەمت نەبێ، ئێمە بە نیازین خۆمان لەم ژیانە رزگارکەین و بچین بۆ هەندەران، ئەمشەو لە ماڵەوە باسی ئێوەمانەکرد تا ئێوەش بێن.
- وریا گیان، بە چییەوە بێم، زۆربەی کەلوپەلی ماڵەوەمان بۆ پاروە نانێ فرۆشتووە، تازە هیچم بۆ ناکرێ، تەواو.
- سامان، ورەم مەڕوخێنە، چونکە زۆر دڵخۆشدەبم تۆم لەگەڵ بیت.
- بۆ من حەز ناکەم بچینە هەندەران، بەڵام دەسەڵاتم نییە، چونکە پارەم نییە.
- وا بزانم تازە کارمان دەستناکەوێ، وا چاکە بڕۆین دوو چا لە چایخانەکەی (مام موراد) بخۆینەوە، پاشان، بە پێ ملی ڕێ دەگرین، باسی چۆنیەتی چوونە هەندەرانت بۆ دەکەم، خەمت نەبێ یارمەتی پارەتیش ئەدەم.
سەیرێ ئەملاوئەولای خۆیکرد، خەڵکێ زۆر کەم لە مەیدانەکە مابوون، ڕۆژ تەواو هەڵاتبوو وگەرمی کردبوو، ڕووم کردە وریا...
با بڕۆین، بەڵام چا ناخۆم.
- پارەی دوو چام پێیە، با بڕۆین.
چوونە چایخانەکە، دوو چایان بۆ هات، زۆر بە بێزارییەوە چاکەی تێکدەدا، سەرنجی وریایدا نیوەی چاکەی خواردبوەوە، فڕێکی لێدا وڕووی کردە وریا و گوتی:
دەبزانم چییدەکەی وچیبکەین بۆ هەندەران؟
- لێرە هیچ ناگوترێ، خەڵکی بۆ پاروە نان و ئافەرینێ ملی یەکدی دەشکێنن، خۆ ویژدان نەماوە، باش بزانە، ئێرە شارێکە رژێم

له بیانوویێ دەگەڕێ ئازارمان بدا و شاربەدەرمان بكات.
- باشه با له سەری نەڕۆین، دوا فڕی له چاكەدا و وریا پارەكەیدا و چوونه دەرەوەی چایخانەكه.
ملی ئەو ڕێیەیان گرت كه چەندین جار لەگەڵ (وریا) به دەمەتەقێوه بەرەو ماڵ دەگەڕانەوه، له كاتی هەرزەكاری باسی كچان و خوێندن بوو، ماوەیێ باسی دڵسۆزی و خەبات له پێناوی نیشتمانبوو، بەڵام ئەمجارەیان باسی جێهێشتنی نیشتیمان وكەسوكاره كه به هۆی هەژاریی ونەدارییەوه دەیانەوێ ڕزگارین وباوەشی گەرمی نیشتیمانی دایك جێهێڵن.
به وریای گوت، فەرموو ئێسته باسی چۆنیەتی چوونه هەندەرانم بۆ بكه.
- سامان گیان، دەچین بەرەو وڵاتێكی ئیسلامی، قاچاخچی شارەزا دەمانگەیەنێ وپارەیێ زۆر كەمی دەوێ، وەك چوونه ئەوروپا نییه پارەیەكی زۆری بوێ، به خێزانەكانمانەوه دەچین، چونكه به مسۆگەری دەگەین، شەوێ لەگەڵ چرۆ باسی ئێوەمان دەكرد، (چرۆ) دەیوت گەر (نازە)م لەگەڵ بێ هیچ خەمم نابێ وناموٚییمان پێوه دیار نابێ.
- سوپاستان دەكەم كه هەمیشه ئێمەتان له بیره، بەڵام من به چییەوه بێم، بێ پاره، كرێچی، چەند بیری لێدەكەمەوه بۆم ناگونجێ.

– مـن کەلوپـەلی نێومـاڵم باشـە و پـارەش لـە بـاوکم وەردەگـرم و یارمەتی باشت ئەدەم، تا هەردوو لامان بتوانین بڕۆین.

– تۆ بڵێی هەروا بە ئاسانی بتوانین بڕۆین؟

– بیر لە پارە مەکەوە، من هەوڵئەدەم هاوکاریت بکەم.

– وابێت منیش هەوڵئەدەم بە یارمەتی تۆ وپشت بە خوا .

– هەر ئێستە لە ڕێوە دەچین بۆ ماڵی ڕێبواری قاچاخچیی تا یەکدی بناسن وپێی بڵێم بووینە چوار خێزان، تا پەلە بکات لە ڕۆیشتنمان.

– بۆچی خێزانی دیکەمان لەگەڵدایە؟

– بەڵێ، ماڵی (فایەقی ئامۆزام و ئەحمەدی هاوڕێم) لەگەڵماندان.

دڵخۆشبوو، هیوایێ لای پەیدابوو، ڕزگاردەبن لەم ژیانە تاڵە. گەیشتنە پێش ماڵی ڕێبوار، وریا لە دەرگایدا، کچێ دەرگاکەی لێکردینەوە. وریا وتی ڕێبوار لە ماڵە؟

کچە وتی نازانم، با بڕۆم بپرسم.

– چۆن نازانی، بڕۆ بڵێ وریا هاتووە.

وەڵامی نەدایەوە، دەرگای داخست وچووە ژوورەوە.ئەمجارەیان ڕێبوار دەرگای لێکردنەوە، وریا(سامان)ی پێناساند، ئیدی تا چوونە ژوورەکەی، هەرخێرهاتن و فەرموو، فەرمووی بوو.

ژوورێ خۆشی هەبوو، لەو سەردەمە ژووری وا خۆش دەگمەن بوو.

هەر کە دانیشتن، ڕێبوار زۆرخێرهاتنی لێکردن.

وریا :ئەمە (سامان)ەو هاوڕێی منداڵیمە، ئازیزمە، حەز دەکات لەگەڵمان بێت.

- بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە، پەنا بە خوا، وەك ئەو خێزانانەی گەیاندوومانن وئێستە لە خۆشترین ژیانن، ئێوەش لەم ولاتە ناخۆش وپڕ نەهامەتییە ڕزگاردەکەین.

سامان زۆر دڵخۆشبوو، دەیویست بە پەلە بگاتە ماڵ ودڵی نازەو منداڵەکان خۆشبکات.

وریا :ئێمە حەزدەکەین سەردانی ماڵە بەدوەکە بکەین، پاشان خێزانەکان لەگەڵ خۆمان ببەین.

- بە چاوان، هەر کاتێ دەڵێن من ئامادەم.

سامان :چۆنە هەر بەیانی بڕۆین؟

- بەیانی کارم هەیە، بەلآم بە دڵنیاییەوە، دوو بەیانی هەر لە بەرەبەیانەوە دەرەچین.

وریا:با زیاتر لەکاتت نەگرین، نەوەك کارت هەبێت.پەنا بە خوا، دوو سبەی هەر سێکمان بەرەو ماڵە بەدوەکان دەڕۆین.ماڵاواییان کرد.

وریا: ئێستە دڵنیابووی؟

سامان :دڵنیابووم، گەر بڕۆین بۆ ماڵی بەدوەکە دڵنیاتردەبین.

وریا وتی وابێ ئەم نیوەڕۆیە دەچین بۆ ماڵی ئێمە، بەڵکو (چرۆ) بزانێ ئێوە دێن، ئیدی دوودڵی نامینێ لە هاتن.ناوی نیوەڕۆی هێنا، موچڕکێ لەشی تەزان، کاتی نانخواردنە، (سۆز و ڕۆز و دایکیان) ئەم ژەمە چیی بخۆن، چۆن ئەم ژەمە بە ڕێکەن، چای نییە!چێشت نییە!گەر کەمێ نان هەبێ بە وشکی، لە دڵەوە گوتی

پەیمانبیّ، ئەم ڕۆیشتنە بکەمە ڕاست ولەم ژیانە قوتارتانکەم، بە دەنگیّ لەرزۆکەوە وتی وریا گیان پیّویست ناکات، حەزدەکەم بچمەوە بۆ مالّ، ئەم هەوالّی ڕۆیشتنەمان بگەیەنم، تا کەمیّ دلّیان خۆشدەبیّ.

– دەچینەوە بۆ مالّ وپاروە نانیّ پیّکەوە دەخۆین، حەزدەکەم (چرۆ) لە زاری تۆوە ببیستیّ کە ئیّوەش دیّن، ئەوسا دلّنیادەبم لە هاتنی چرۆ.

نەیتوانی دلّی بشکیّنیّ، چوو بۆ مالّیان.لە دەرگایاندا، دەرگای کردەوە، کە بینیی، وایدەزانی برایی خۆی بینیوە، زۆر پەرۆشبوو، دیاربوو وتەوتەی چوونە هەندەران، تەواو میّشکی ئالّۆزان بوو پیّویستی بەوەبوو یەکیّ هاندەریبیّ تا دوا بڕیاربدا.زۆرخیّرهاتنی لیّکرد.

– ژنەکە، تۆ کەی وا خیّرهاتنی (سامان)ت کردووە، بڕۆ خواردنیّکمان بۆ ئامادەکە، خیّرهاتن بەسە.

سامان : نەخیّر وا نییە، نیّوان من وچرۆی خوشکم بە تۆ تیّکناچیّ، هەموو کات بە گەرمی خیّرهاتنی کردووم.بە چرۆی وت چییدەلّیّ با بلّیّ، گویّی لیّمەگرە، چیتان هەیە ئەوەمان بۆ بیّنە بیخۆین. وریا:تۆ ئەوەندە خوشکەکەت خۆشدەویّ، بۆ هەوالّەکەی پیّ ڕاناگەیەنی کە ئیّمە لە کویّ بووین، دەمانەویّ چیی بکەین.

- چرۆ، لە ماڵی ڕێبواری قاچاخچیی بووین، گەر خوا ڕێکیخا، ئێمەش لەگەڵتان دێین بۆ هەندەران.
- بە ڕاستتە کاك سامان؟!
- زۆر بە ڕاستمە، گەر بتوانین پارەکەی بۆ دابینکەین.
وریا: دە ئێستە بە پەلە خواردنمان بۆ ئامادەکە.
- بە سەرچاو هەر ئێستە.هەر بە پەلە چوو بەرەو مەتبەخ، خواردنی ئامادە کرد، پاشان چاکەی هێنا بە دەم چا تێکردنەوە، گفتوگۆی چوونە هەندەران بوو.
نەخۆشی هەندەران هەموو شوێنێکی گرتبوەوە، لە نێوان پیر، گەنج ، ژن و منداڵ، باس باسی هەندەران بوو.
چرۆ وتی کەواتە ئێستە بە دڵنیاییەوە، دەڵێم، دەچین بۆ هەندەران.
وریا وتی ئۆخەی، خۆ رزگاربووم لە دوودڵی چرۆ.
سامان :وا چاکە بڕۆم، ئەم هەواڵە بگەیەنمە نازە و منداڵەکانم، چونکە بە ڕاستی نەبوونی وهەژاریی باری دەروونی هەمووانی تێکداوە، بەڵکو بەم هەواڵە تۆزێ خۆشی وهیوا دەچێتە دڵیانەوە، کەمێ لە ئازارەکانیان کەمدەکاتەوە.
ماڵی وریای جێهێشت و زۆر بە پەلە دەڕۆیشتەوە.
کاتێ نزیك ماڵ بووەوە، وایدەزانی ماڵێ بێگانەیە، لای دەرگاکە کەمێ وەستا، بە شەرمەوە، زۆر بە وریاییەوە لە دەرگایدا، دڵی دەلەرزی، حەزیدەکرد منداڵ نووستبن، تا سەرنجی دەستی نەدەن

کە هیچی هەڵنەگرتووە، چونکە ئەو ڕۆژانەی کرێکاری بکردایە کەمێ خواردنی بۆ دەهێنانەوە.
نازە دەرگای کردەوە، سۆز و ڕۆز لەگەڵی نەبوون، یەکسەر پرسیاری کرد، مناڵەکان لە کوێن؟
ئەویش بە دەنگێ کز وپڕ نائومێدیی، گوتی نوستوون.
تەماشای دەستی بەتاڵی کرد وتی کرێکاریت دەسنەکەوتوە؟!
– نەخێر نازە گیان، بەڵام هەواڵێ زۆر خۆشم دەسکەوتووە.
– هەرچیی هەواڵی خۆش هەیە زوو پێم بڵێ، چونکە زۆر دڵتەنگم، نازانم چییبکەم، نەخوازەڵا، ئەوڕۆ منداڵەکان تەنیا نان وئاویان خواردووە، ئەوانیش بەم منداڵییە بە خەیاڵ و خەم وبرسیەتییەوە خەویان لێدەکەوێ.
ئەم قسەیەی ئاگری لە جەرگی کردەوە، حەزی دەکرد هەر ئەو کاتە ڕوو لە هەندەران بکەن.
وتی:دانیشە با باسەکەت بۆ بکەم.دیاربوو زۆر پەرۆشبوو، بێپێچوپەنا، یەکسەر وتی لەگەڵ ماڵی وریا دەچین بۆ دەرەوە
– چۆن سامان گیان، بە ڕاستتە؟!بە ڕاستی هەواڵی خۆشە!بەڵام یەکسەر کەمێ ساردبووەوە وتی ئەی پارەمان لە کوێ بوو؟خۆ ئەو کەسانەی دەچن بۆ دەرەوە چ ماڵومولکیان هەیە دەیفرۆشن، ئینجا، گەر بەشی چوونیان بکات.

- ڕاستدەکەی، ئێمەش چییمان هەیە دەیفرۆشین ومالّی وریا هاوکاریمان دەکەن، بۆ ئەورویپاش ناچین تا پارەی زۆری بوێت، بۆ وڵاتیّ ئیسلامی دەچین و وەرگرتنمان مسۆگەرە.

لە سەرەتاوە باسەکەی بۆ کرد، ئاهێکی هەڵکێشا وتی بە ڕاستە سامان گیان، ئێمە لە هەژاریی وکرێچێتی ڕزگاردەبین، بڕوا ناکەم، قەت بڕوا ناکەم، قوڕگی پڕ لە گریان ببوو، بە دەنگیّ لەرزۆکەوە گوتی سامان تۆ لە مالّ نیت، سۆز و ڕۆز زۆر برسین، بێبەرگن، تەنانەت قسەی خۆشیان نەماوە، بەم منداڵییە هەمیشە لە قووڵایی دەریایەکی پڕ لە خەمن، ئاخۆ گەورەبن چیی لە بارەی منداڵیی خۆیانەوە بڵێن، دەبیّ چیی بە ئێمە بڵێن، تەنیا باسیان، باسی نەهامەتیی وهەژاریی دەبێت.قسەکانی نازە ئارەقی پێکرد، هەستی دەکرد تاوانبارە، (ڕۆز و سۆز)ی بینی چوونەتە دونیایەکی دیکەوە، دەستە خنجیلانەکانیان لە ملی یەکدیکردبوو، حەزی نەدەکرد لەو خەوە خۆشەیانکا، تەنانەت نەیدەویست خۆشیان هەستن، لەبەر ئەوەی لە چاوەکانیان زۆر داواکاریی بەدی دەکردو لە توانای نەبوو جێبەجێیکا، نەیتوانی پتر سەیری دیمەنی پاك وبێگەردییان بکات.

دەستی برد بۆ فرمێسکی سەر ڕوومەتی(نازە) و سڕییەوە، وتی: نازە گیان، پەنا بەخوا، ئیدی دوا ناخۆشییمانە وتاراوگە هەموو شتمان بیردەباتەوە، منداڵەکانمان لەوپەڕی خۆشیدەبن، پێشینان وتوویانە "دوای هەموو ناخۆشییّ خۆشییە".

نازه زانی قسەکانی کاریبوو، داوای لێبوردنی لێکرد و وتی سامان گیان، تۆ هیچ بێخەم نەبوویتە وهەر لە شەوەوە هەڵدەستی بۆ رۆژە کرێکاریی، بەڵام بارودۆخی ولاَت ئاڵۆز وشێواوە، هەر ئێمە وانین زۆربەی خەڵکی بژێوییان خراپە، سەری نایە سەر ڕانی، کەوتە قسەیخۆش وتی زویر نەبی، گەر نەگریمایە، خەمەکان دڵیان دەتەقانم.

دەستی لە نێو قژەکەی نا و وتی هیچ کات لە تۆ زویر نابم، زۆر هاوسەر جیابوونەتەوە لەبەر هەژاریی ونەداریی، دادگای ولاَت ئەوەندەی مامەڵەی جیابوونەوە جێبەجێدەکا، مامەڵەی مارەکردن ناکات، کەچی ئێمە سۆزی خۆشەویستییمان بە تینتر دەبێ.

سەرنجی چاوەکانیدا، وتی:

بچۆ چاوەکانت بشۆ، نەك یەکێ بێ وبە هەڵە لێمان تێبگا، با نەزانن گریاوی.

– سامان گیان ، بە چاومەوە دیارە.

– کەمێ دیارە، بەڵام چاوەکانی جوانتر کردووی.

– بیرتە هەموو کات لە ڕێی قوتابخانە بە تەنیشتمەوە تێپەڕ دەبووی وبە دەنگێ نزم دەتوت ئەم کاتەت باش چاو جوان گیان.

– نازە گیان، خۆزگەمان بەو کات ، لە بەهەشت بووین، بەڵام نەماندەزانی.

بە پەلە سەری لە سەر ڕانی لابرد وتی با بچم چاوم بشۆم تا یەکێ نەهاتووە.ئەو چوو بۆ گەرماو.

بــە دەم خەیاڵــەوە، دەســتی لــە نێــو سمێڵــی نــابوو وتەڵتــەڵ ڕایدەکێشا. لە دەرگا درا، بە پەلە چوو دەرگای کردەوە، چەند پریاسکەیەکی بە دەستەوە بوو، هاتە ژوورەوە، سڵاوی کرد.وتی وریا ئەوە چییە؟وتی تۆ جاریّ وەڵامی سڵاوەکەم بدەرەوە.

وتی:سەرچاوم بەخێربێی، دە ئێستە پێم بڵێ ئەو پریاسکانە چین؟

– چرۆی خوشکت ناردویەتی.

– وریا گیان، گەر ئێمەتان خۆشدەویّ دەیبەیتەوە.

(نازە) هات، بە خێرهاتنی (وریا)ی کرد وتی کاك وریا هەموو شتمان هەیە بۆ هێنات.وریا سەیری کردن و وتی بە ڕاستتانە !!، بە خوا کاکە نایبەمەوە، خۆ من حەماڵی ئێوە و چرۆ نیم.

پریاسکەکانی دانا وتی، بەڵام نازەی خوشکم، لەو چایەی چرۆ ناردووی، عەسرە چایەکمان بۆ بکە.

نازە گوتی هەر ئێستە.

چای لێنا و هێنای.وریا وتی دوو سبەی من و سامان لەگەڵ ڕێبواری قاچاخچی بۆ ماڵە دەوارنشینەکان دەچین تا دڵنیابین لە چۆنیەتی ڕۆیشتنمان، ئێستەش دەچین بۆ ماڵی (فایەقی ئامۆزام) لەگەڵ (ئەحمەد)ی هاوڕێم، ئەوانیش دوو خێزانن لەگەڵمان دێن.

لەگەڵ وریا چوونە دەرەوە، سەردانی ماڵی (فایەق وئەحمەد) یان کرد. تێیگەیاندن دوو سبەی لەگەڵ ڕێبواری قاچاخچیی دەچن بەرەو خوارووی وڵات.پاشان لەگەڵ وریا چوون بۆ سەردانی دایکی کە لە ماڵی برا گەورەکەی بوو.وێڕای ئەوەی خاوەنی منداڵی

زۆربوو، بەڵام بە کارەکەی دەیتوانی بیانژێنێ.ئێوارە لە وریا جیابووەوە وبەرەو ماڵ دەڕۆیشتەوە، زۆر دڵخۆشبوو، بیری دەکردەوە دەبێ ئەمە ڕاستبێ، هەروا بە ئاسانی بگەنە هەندەران.کە باوکیان بینی بە پەلە بە پیریەوە چوون، ئامێزی بۆ کردنەوە.ڕۆز وتی بابە گیان، کەی دەچین بۆ هەندەران؟

– ئینشەڵڵا کچەکەم بەم زووانە دەچین.وازیان لێنەدەهێنا، حەزیان بە یاری دەکرد، چونکە ئومێدێ لە دڵە ناسکەکانیان چرۆی کردبوو.

# چوون بەرەو دەوارنشینەکانی بیابان

سامان وتی................

پاش دوو ڕۆژ، ئەو شەوەی بۆ بەری بەیان بە نیاز ڕۆیشتن بووین، وەك شەوانی زستان وابوو، كۆتایی نەدەهات، خەیاڵ نەیدەهێشت بنووم.کاتژمێرێ زووتر لە گەراج لە چاوەڕوانیدا بووم، ئیدی بەیەککگەیشتین وسواری پاس بووین بەرەو بەغدا.

پاش چەند کاتژمێرێ نزیکی پایتەخت بووینەوە، هەموو لە ترسان ئەبڵەق ببووین، چونکە زاڵگەی پێش چوونە پایتەختەوە، دڕندەترین داروەدەستەی ڕژێمی لێبوون، لە بیانووێ دەگەڕان بۆ ئازاردانی هاووڵاتیان، نێو پاسەکە ببووە مزگەوت، هەر یەکەو لای خۆیەوە دەمی دەجوڵان و ئایەتی کورسی و قولەکانی دەخوێند. پاسەکەمان چووە نۆرەوە بۆ پشکنین، نۆرەمان هات، قولەڕەشێ سەرکەوت، تاجێ لە سەر شانیبوو، " قەڵەو، چوارشانە، قژلول و لچ ئەستوور" بێئەوەی سڵاو بکات، بە توڕەییەوە بە دەنگێ کەرخەوە گوتی هەموو دابەزن.هیچ کەس نەیدەوێرا سەیری بکات، نەوەك بیانووی لێبگرێ.

له خواره‌وه ڕیزمان به‌ست بۆ پشکنین، ته‌ماشای ناسنامه‌ی یه‌که به یه‌که‌ی ده‌کرد، له ناکاو گه‌نجێکی دایه به‌ر شه‌قوزلله، هه‌موو به جارێ ئه‌بڵه‌قبووین، من زۆر ده‌ترسام چونکه(ده‌فته‌ر خدمه‌که‌م) ته‌واو نه‌ده‌خوێنرایه‌وه، (نازه ڕۆژێکیان له نێو گیرفانی کراسه‌که‌م ده‌رینه‌هێنابوو و شۆریبووی).گه‌نجه‌که به زمانی کوردیی هاواری ده‌کرد، ئه‌ویش ئه‌وه‌نده‌ی دیکه‌ی لێده‌دا، کابرایه‌کی ڕیش سپی بۆ لای ئه‌فسه‌ره‌که چوو تا واز له گه‌نجه‌که بێنێ، پاڵێکی به ڕیش سپییه‌که‌وه‌نا، که‌شیده‌که‌ی که‌وته سه‌ر زه‌وی، ڕه‌نگی تێکچوو، که‌شیده‌که‌ی هه‌ڵگرته‌وه وله‌گه‌ڵ هه‌ڵگرتنه‌وه‌ی که‌شیده‌که‌ی ده‌می ده‌جولا وجنێوی به ئه‌فسه‌ره‌که ده‌دا.دوو سه‌رباز هاتن بۆلای ئه‌فسه‌ره‌که و وتیان گه‌وره‌م هیچت ناوێ، تفێکی له ڕیشی گه‌نجه‌که کرد، وتی بچن ئه‌م ڕیشه پیسه بتاشن وله ژووره‌وه زیندانی بکه‌ن تا دێم.

هه‌ر به قۆناغه تفه‌نگ گه‌نجه‌که‌یان برد به‌ره‌و ژووری زاڵگه‌که. ده‌ستم بۆ ڕیشم برد وتم ده‌بێ ڕیشم هاتبێ وئاگام لێنه‌بووبێت!. ئه‌فسه‌ره‌که، له توڕه‌ییدا ڕه‌نگه ڕه‌شه‌که‌ی، به ڕه‌نگێ زه‌ردی سیلاوی ئاسا داپۆشرا، هه‌ناسه‌ی ته‌نگببوو، جنێوی به کورد ده‌دا و به‌خیانه‌تکار و تێکده‌رناوی ده‌بردین.زۆر ترسام ئێمه‌ش به ده‌ردی ئه‌و گه‌نجه به‌رێت، چونکه کوردین.گه‌یشته نۆره‌ی من، وه‌ك ئه‌وه‌ی تاوانێکم کردبێ وچاوه‌ڕوانی دادگایی بم، به خوێندنی

ئایەتیول کورسی چوومە پێشەوە، وتم خوایە گیان تەنها ئەمجارە ڕزگارم بکە وتی دەفتەرەکەت بۆ وایە، هیچی ناخوێنرێتەوە.
وتم :بەڵێ وایە، بە نیازی گۆڕینیم.
وتی : جارێ دی ئەم دەفتەرە وا نەبینم ، باش؟
وتم :بەڵێ باشە بە سەرچاو.دەفتەرەکەم وەرگرتەوە وبە پەلە سەرکەوتم، کەمێ هۆشم هاتەوە.لە جامی پاسەکەوە هەر ملەقوتێم بوو، ئاخۆ وریا ورێبوار رزگاربوون,گەیشتە نۆرەیان، لە نێو پاسەکەوە نزام دەکرد وئایەتم دەخوێند تا ئەوانیش ڕزگاربوون.
هەموو سەرکەوتن، شوفێرەکە بەوپەڕی ڕێزەوە، زۆر بە ترسەوە، وتی گەورەم، ئەی ئەو گەنجەی بۆ ژووری زاڵگەکە ناردت؟
بە تووڕەییەوە، بە دەنگێ گڕەوە، وتی دەرچۆ، ئەوە (تێکدەرە-موخەڕیبە).لە زاڵگەکە دوورکەوتینەوە، خەڵکی هیچیان لە بیرنەما، تا گەیشتینە نێو پایتەخت، بە پێکەنین و قسەکردنەوە بردیانە سەر، هەر یەکەو "ئاگرە سوورە لە خۆی بە دوور بوایە"، ئیدی گوێی نەدەدا.لەبەر توندوتیژیی رژێم ونالەباری ئابووریی، زۆربەی خەڵکی تووشی خۆپەرستیی ودوورکەوتنەوە لە بەزەیی هاتنەوە بە یەکدی ببوون.ڕێبوار وتی لێرەوە هیچ مەترسی نییە، چونکە ئەم ناوچانە عارەبن.گەیشتینە نێو شار، لەوێوە چووین بەرەو گەراجی شارەکانی خواروو.
نزیک نیوەڕۆبوو، گەیشتین، بێئەوەی هیچ زاڵگەیێ بمانپشکنێ، لەوێوە سواری پاسێ دیکەبووین، تەواو لەو شارەش دوور

کەوتینەوە تا گەیشتینە چۆڵەوانی، ئەمبەروئەوبەری ئەو شەقامەی پیا دەڕۆیشتین بیابان بوو هیچ ئاوەدانی بەدی نەدەکرا، لەوێدا دابەزین لە پاسەکە.

سەرمسوڕما، دەموت دەبێ هەڵەی نەکردبێ، بەڵام حەزم نەدەکرد پرسیاربکەم، (وریا)ش هەر وەك من وابوو.ڕێبوار وتی ئەلێرەوە دەبێ بە پێ بڕۆین بۆ ماڵ بەدوەکە.

وریا :ڕێبوار، هیچ ئاوەدانیی دیار نییە، ئێمە بەرەو کوێ دەچین، خۆ ڕێت لێهەڵە نەبووە؟

– خەمتان نەبێ، ئێوە یەکەم کەس نین بێرەدا هێنابیانم، چەند کاتژمێرێکە ودەگەینە ماڵی (ئەبوجاسم).

کەوتینە بڕینی ڕێی بیابان، زۆر ڕۆیشتین، لە ڕۆیشتنی نێو بەفر ناخۆشتربوو، قولەپێم ئازاریدەدام، بەڵام بێدەنگبووم.نزیك دوو کاتژمێر ڕۆیشتین، هێشتا هیچ ئاوەدانی بەدی نەدەکرا، حەزم دەکرد پرسیاربکەم کە زۆر ماوە بگەین، بەڵام وریا پرسیارەکەی منی کرد ڕێبوار وتی نەخێر زۆر نەماوە، هیچی دیکەی نەگوتەوە، بێدەنگبووین. کات نیوەڕۆ ببوو، تینی گەرما بەرزببووەوە، قوڕگم وشکببوو، هێند تینوێتیی تەنگی پێهەڵچنین برسێتیی بیر برد بووینەوە، دەمویست کەمێ پشوودەین، لە ناکاو ڕێبوار گوتی ئەو ڕەشاییە دەبینن، ئەوە ماڵی بەدوەکەیە.نزیك دیاربوو، ورەمان کەمێ بەرزبووەوە، بەڵام گەیشتن بەو ڕەشاییە نیو کاتژمێری خایاند، کە نزیکبووینەوە، سەگوەڕ دەسیپێکرد، ژن و منداڵێ لە

دەوارەکەوە هاتنە دەرەوە، دەنگیان لە سەگەکان نەدەکرد، ڕێبوار لە دوورەوە هاواری کرد بۆ ژنەکە، ژنەکە ڕێبواری ناسییەوە وئینجا دەنگی لە سەگەکان کرد و لە وەڕین کەوتن.

ژنەکە سەرپۆشی لە سەربوو، تەنیا چاوەڕەشەکانی دیاربوو، بەژن وبالای بە جلێ تەسکوڕەش داپۆشرابوو، کەمەرتەنگییێ بێوێنەی پێبەخشیبوو، پێی پەتیبوو، پەتییەکەی زۆر سەرنج ڕاکێش، سەیرم دەهات، لای خۆمان تەنوورەی تا چۆك، جۆرین مکیاج بەکاردێنیێ، کەچی وەك ئەم ژنە بەدوە سەرنج ڕاکێش نەدەبوو.

زۆرخێرهاتنی لێکردین، ڕێبوار بانگی منداڵەکەی کرد، باوەشی لە منداڵەکەدا وماچیکرد، بەلام ماچی کوێی، لم و چڵم و لیك قەتماخەی لە سەر ڕوومەتی دروستکردبوو.

ڕێبوار وتی ئەی ئەبوجاسم لە کوێیە؟

وتی هەر لەم نزیکەیە ، کاتی هاتنەوەیەتی.

جامێ ئاوی هێنا، لە جامی گەرماودەچوو، قوپاو و ڕەشەوە بوو، وریا یەکەمجار وەریگرت ، دوو فڕی لێدا و دایە دەستی من.وتم وریا تینووت نییە؟وتی بیخۆرەوە بزانە چۆنە .فڕێکم لێدا لە بەر سوێری نەدەخورایەوە، دوو فڕی دیکەم لێدا تا کەمێ دەم و ریخوڵەکانم تەڕکەم، ئینجا دامە دەستی ڕێبوار، ئەو ملی پێوەنا و تەواویکرد، بە پێکەنینەوە وتی وا دیارە ئێوە تینووتان نییە.وتم دەزانی زۆر سوێر بوو، چۆن توانیت هەمووی بخۆیتەوە؟!وتی من ڕاهاتووم، گەر ئەم ئاوە سوێرەش نەبێ، هەموو تووشی دابەزینی فشار دەبن، ئەم ئاوە

جێی ئەو هەموو ئارەقە دەگرێتەوە کە لەبەر گەرما و بڕینی ڕێی بیابان دەریدەدەن.

- ئەم بەدوانە و لەم چۆڵەوانییە ، چۆن دەناسی؟!

- کاتی خۆی لەبەر وشکە ساڵی هاتنە دەوروبەری شارەکەمان، ئەو کات من لە نەخۆشخانە یاریدەدەری پزیشك بووم، ڕۆژێکیان ئەم (ژنەی ئەبوجاسم)یان هێنا ، نەخۆشبوو، زۆر ماندوو دیاربوو، منیش یەکسەر تەبڵەم بۆ کرد، زۆر بە تەنگییەوە بووم، چونکە غەریب بوون، (دە) ڕۆژ لە نەخۆشخانە مایەوە، هەموو کەسوکاری ئەبوجاسم کە دەهاتن منیان بە کەسی خۆیان دەزانی، کە دەرچوو لە نەخۆشخانە، بانگێشتیان کردم بۆ نانخواردن، ئاشناییمان پتر پەرەی سەند، چییان پێویست بوایە بۆم دابین دەکردن.ڕۆژێکیان چووم بۆ سەردانییان، خۆیان کۆدەکردەوە بگەڕێنەوە ئەم بیابانە، ناونیشانیان پێدام و گوتیان گەر ویستت بڕۆی بۆ هەندەران، وەرە لای ئێمە وزۆر بە ئاسانی دەتگەیەنین، منیش پاش چەند مانگێ هاتم و لەم بیابانە دۆزیمنەوە، بەڵام کە ئێرەم دۆزییەوە، پەشیمان بوومەوە بۆ هەندەران بچم، لەگەڵ ئەبوجاسم ڕێککەوتم، خەڵکی وەك ئێوەی بەڕێز بێنم و لێرەوە ڕەوانەی ئەو دیویان بکەین، ئیدی لەوساوە ئەم کارە دەکەم.

وریا : ڕێبوار ئەم شەو لێرە دەبین؟

- نەخێر، هەرکە هاتەوە، قسەی خۆتان بکەن و کاتی ڕۆیشتنتان دیاری دەکەین و دەگەڕێینەوە.

لـەم قسـانـە بـووین، ڕێبـوار وتـی ئـەوە ئەبوجاسـم هاتەوە.کـە تـەواو نزیکبـووەوە و ڕێبـواری ناسـییەوە، هـەر بـە "هەلـە ، هەلـە بکاکـە ڕێبوار"دەهاتە پێشەوە، تا گەیشت و باوەشی لە (ڕێبوار)دا، ئینجا باوەشی بە ئێمەدا کرد، لە بۆنی ئارەقی، تـەواو وەڕەس بووم، هێنـد جگەرەی خواردبوو، سمێڵ و دانەکانی تەواو زەرد ببوون، ڕەش ولچ ئەستوور، لاواز و درێژ، بە دشداشـەکەی درێـژیی پـتر دەردەکـەوت ، پێی پەتی بوو، پاژنـەی پێـی شەقارشـەقار ببوو.بـە پەلـە چـوو بـۆلای خێزانی تا بزانـێ چـیی ئامـادە کـردووە بـۆ نیـوەڕۆ، هاتـەوە و کـەمێ دیکـە دانیشـت، هـەر خێرهـاتنی لێـدەکردین، دەیزانـی بۆچـیی هـاتووین بـەلآم نەیـدەگوت بۆچـیی هاتوون.دیسـان چـووەوە بـۆ لای خێزانی ئەمجارەیان هاتەوە گونیەکی سپیی هێنا و ڕایخست، چوار بـەردی لـە سووچـەکانی دانـا تـا بـا نـەیبات.ڕێبـوار وتـی ئەمـە خوانەکەیانـە.چـەند نـانێکی هێنـا، هـەر نـانی دوو ئەوەنـدەی نـانی خۆمان دەبوو، پاشان دوو قاپی شلەی بامێی هێنا، چووەوە قاپێ دی هێنا، قاپەکان ، قووڵ قوپاو و ڕەشەوە بوو.فـەرمووی لێکـردین، بـەلآم خـۆی دانەنیشت و بە پێـوە وەسـتا، زۆر هەوڵمانـدا دانیشـێ، سوودی نەبوو.

نانمان گوشییە شلەکەوە و بێ کەوچك دەسمانکرد بە نانخواردن، بە تیل چاو سەیری (ئەبوجاسم)م کرد، پەنجـەی لـە نێـو لوتیـابوو، دڵـی تێکدام، بەلآم چار نـەبوو، زۆر برسیبووم، بە پەلـە چاوم خستەوە سـەر خواردنەکـە، وێنەکـەی لـە نێـو چێشـتەکە دەرکـەوت، بـە

قێزوبێزەوە برسیەتێکەم شکا و وازم لە نانخواردن هێنا، سەیرێکی کردم پەنجەی لە لوتی دەرهێنا، وتی بۆ دەسهەڵەگری، تۆ هیچت نەخوارد. وتم نانخواردنم هەر ئەوەنەیە.(لە دڵی خۆم وتم لوت خواری چڵماوی تۆ هێشتت).(رێبوار و وریا)ش وازیان لە نانخواردن هێنا، ویستمان کۆیکەینەوە، بەلاّم نەیهێشت، هەر سێ قاپەکەی نزیك کردەوە، بەرماوەکانی لە نێو قاپێکا کۆکردەوە، هەر بە دەستە پیسەکەی کەوتە نانخواردن ، مشەمش و مڵچەمڵچی وەڕەسی کردم، پاروەکەی لە نێو دەستی دەهێنا ودەبرد، وەك هەویری لێدەکرد، ئینجا دەمی بستێ دەکردەوە و فڕێی دەدایە نێویەوە، تا لە نانخواردن دەستی هەڵگرت، مووەکانی لەشم هەموو هەستابوون، پاشان قۆرییەکی ڕەشیی گەورە، چوار پەرداخی فافۆن وکیسەیەکی سپیی چڵکن کە شەکری تیابوو، هێنای و چای بۆ تێکردین، یەکەمجار بوو، چای سوێر بخۆمەوە، لە پەرداخی فافۆن.پاش چا خواردنەوە رێبوار وتی دەزانی بۆچیی هاتووین؟وتی بەڵێ دەزانم، ئەم بەڕێزانە بگەیەنینە ئەودیوو.

– ئەم بەڕێزانە جیاوازن لەگەڵ ئەوانی دیکە، ئەمانە خزمی خۆمن و خێزانیان لەگەڵدایە.

– بە سەرچاو، خزمی تۆبن خزمی منن.

وریا : سوپاستان دەکەین، بەلاّم حەزدەکەین بزانین بڕی چەند پارەی تێدەچێ؟

- ڕێبوار دەزانێ لە خەڵکی چەندمان وەرگرتووە، بەڵام بۆ ئێوە کەمتر وەردەگرین.

وریا : بڕێ پارە بڵێن لە توانامان بێت.

ئەبوجاسم کەمێ بێدەنگبوو، ڕێبوار هاتە دەنگ وتی ئەمانە چوار خێزانن، منداڵیان لەگەڵدایە.ئەبوجاسم بێدەنگی پچڕان و وتی واتە هەشت کەسن بێ منداڵەکانیان.ئەبوجاسم یارمەتی لێوەرگرتین، لەگەڵ ڕێبوار کەمێ دوورکەوتنەوە چارەکە کاتژمێرێکیان پێچو، هاتنەوە، ڕێبوار وتی وابزانم زۆر بە ویژدانەوە بڕێ پارەی تەرخان کردووە، هەر خێزانی، تەنیا (ژن و مێرد)، شەشسەد هەزار دیناری چاپی عێراقی.

ئەو بڕە پارەیەی وت، دڵم زۆر ئازاریدام، هیواکان خۆیان شاردەوە، مەیدانی کرێکاران و برسێتیی و بێ بەرگی منداڵ هاتەوە پێشچاوم، وایلێکردم هەوڵدەین وپارەکەیان زۆر پێ کەمکەینەوە، چونکە ئەو پارەیە بە هیچ شێوەیێ پەیدا نەدەبوو، گەر وریاش یارمەتیم بدات هەر بۆیە وتم پارەکە زۆر زۆرە و لە توانامان نییە.

- باوەڕ بکەن، خەڵکیمان بە یەك ملیۆن بردووە و منداڵشمان ئەژمارە کردووە، بەڵام بۆ ئێوە جیاوازە.لەو بڕە پارەیە کەمتربێ ناتوانین، ئەوە ڕێبوار باش دەزانێ.

وریا : ئەبو جاسم وابزانە هاتووینەتەماڵەکەت وگرفتێکمان هەیە تۆ وەك برایەك چارەسەری دەکەی.

ڕێبوار ڕووی کردە ئەبو جاسم وتی کەمێ تر وەرە خوارەوە.

بە نا بەدڵییەوە وتی با نیو ملیۆن بێ، لەوەش کەمتر نابێ.
وتم : وابێ هیچ یارمەتیتان نەداین.
رێبوار : ئەبو جاسم راست دەکات، لەوە کەمتر بڕوا ناکەم دەریبێنێت بۆ منیش ئەو مەترسییە گەورەیە دەریناهێنێ، ناتوانم بتانهێنم.
وریا : (کاك رێبوار، ئەبوجاسم)، دەبێ ئێمەش شتێ بڵێین.
رێبوار : فەرمووو بڵێ.
– هەر خێزانێ چوارسەد هەزار.
رێبوار بە ئەبوجاسمی وت ، ڕازیت؟
ئەبوجاسم کەمێ بێدەنگبوو، جگەرەیەکی داگیرسان و مژێکی لێدا وتی خۆت دەزانی زۆر کەمە، چونکە هەژارن وخزمی تۆن، ڕازیم.
رێبوار :کەواتە، چەند رۆژی تر بێین؟
– چوار ڕۆژی دیکە کە دەکاتە چوارشەممە، دەبێت لێرە بن.
وتم :من نازانم دێم یان نا، چونکە ئەو پارەیە پەیدا نابێ.
وریا :سامان، لەم پارەیە کەمتر نامانبەن، ئینشەڵڵا هەوڵی بۆ ئەدەین. نزیك عەسر بووینەوە، کاتی ئەوە بوو بڕۆین، زۆر هەوڵیدا، شەو لەوێ بمێنینەوە، بەڵام نەماینەوەو ماڵاواییمان لە ژنەکەی کرد ، خۆیشی لەگەڵمان کەوتە ڕێ.
پاش کەمێ ڕۆیشتن، بە زۆر گەڕانمانەوە وکەوتینە بڕینی ڕێی بیابان بەرەو ئاوەدانی.وریا وتی خەمت نەبێت، کەلوپەلمان دەفرۆشین، گەر هەر بەشی نەکردین، پارە لە باوکم وەردەگرم کە

گەیشتینە هەندەران بۆی دەنێرینەوە، دوو دڵ مەبە، دڵنیابە، بێ تۆ بستێ ئەم بیابانە نابڕم.ئەم قسەیەی وریا دڵی خۆشکردم.
ڕێبوار وتی ئێوە هەر بگەنە دەرەوە ژیانتان دەگۆڕێ ودەبنە پارەدار، بە تایبەت ئەو شوێنەی ئێوە بۆی دەچن.ئەم قسەیەش پتردڵی خۆشکردم ، ئەمجارەیان بە گوڕتر دەڕۆیشتم، ئازاری قولەپێم بیر نەما، خەیاڵ داگیری کردم ونەمدەزانی بە سەر لما دەڕۆم، جاروبار حەزم دەکرد ڕێیەکە دوورتربێ تا خەیاڵ بمباتەوە، هەندێ جاریش خۆزگەم دەخواست باڵم هەبوایە وبفڕیمایە تا بە زوویی هەواڵەکەم بگەیاندایە.
ئەو خەونە هاتەوە یادم، لە خۆشترین تەلارا بووم و خێزانەکەم بە کامەرانی دەژیا، دەموت تۆ بڵێی ئەو خەونەم بێتەدی؟!
وریا و ڕێبوار، دەمەتەقێیان بوو، بەڵام من ئاگام لە هیچ نەبوو، تەنیا جاروبار دەمیانم دەبینی دەجولایەوە وا خەیاڵ مێشکی ئاڵۆزاند بووم.لە ناکاو وریا وتی سامان وا نییە؟
بە ئاگا هاتم و وتم چیی بڵێی ڕاستە.
یەکسەر گەڕامەوە سەر خەیاڵەکەم.دیسان پرسیاریان لێکردم.( لەم بیابانەوە بڕۆن بۆ هەندەران، پێت باشە؟
– بۆ باش نییە، گرنگ ئەوەیە بتوانین بێین، گەر بمانەوێ بگەین نابێ گوێ بدەینە ناخۆشی ڕێوبان و ماندوبوون.زۆر درێژەم بە وەلامدانەوە نەدەدا، دەمویست تەنیا بوومایە، یا ئەوان زۆر لە پێشمەوە بوونایە.

بـه خـەیالْ وقسـە کردنـەوە تـەواو نزیکبووینـەوە لـە شـەقامەکە، گەیشـتینە سـەر شـەقام وەك ئـەوەی لەگـەڵ شـوفێرەکەی بـەیانی بەڵێنمان دابێ، ئێمەی بینی وەستا، سوار بووین وچووینە ناو شار، لـەوێوە بـەرەو پایتـەخت گەڕاینـەوە. لەگـەراجی پایتەختـەوە سـواری پاس بووین و گەڕاینەوە بۆ شارەکەمان.

وامەزانی ماوەیێ زۆرە دوورکەوتوومەتەوە لە شار ولە خێزانەکەم، کەچی هەموو چەند کاتژمێرێ بوو.

نیـوە شـەو بـوو، شـار زۆر هـێمن بـوو، لـە تاکسـییەکە دابـەزین، لـە یەکـدی جیابووینـەوە، بـە پەلـە هـەنگاوم دەنـا، جاروبـار سـەیری ئەملاوئەولای خۆم دەکرد، (دەترسام مەفرەزەیەکی رژێم تووشمبێ و بمگرن، لەم خەو وخەیاڵە خۆشانەم بکەن و زیندانە تاریکەکانی رژێـم قووتمـدا و هـەرگیز ڕووناکی نەبینمـەوە، وەك زۆر لـە کـوردان نەیانبینییەوە).

کە گەیشتم ، لـە دەرگامـدا، نـازە بـە پەلـە دەرگـای کـردەوە ، هـەر لـە چاوەڕوانیی بوو، نەنووستبوو. وتی سامان گیان، بـە خێربێیتـەوە، بۆ وا درەنگکەوتن.

هـەر بـە پەلـە حـەزم دەکـرد هەواڵەکـەی پێڕاگەیـەنم و وتم نـازە گیـان، شـوێنەکە زۆر دووربـوو، چـوار رۆژی دیکـە دەبـێ بگەینـە ماڵـە بەدوەکـە. پارەیـەکی زۆرش داوا نـەکراوە، دەبـێ هەوڵـدەین کەلوپەلەکانمان بفرۆشین، گەر بەشی نـەکردین ، وریـا هاوکارییمـان دەکات.

زۆر دڵخۆشبوو، بە سەرسوڕماوییەوە، وتی بە ڕاستە سامان گیان، ئێمە چوار ڕۆژی دی دەڕۆین؟!

وتم بەو چاوە جوانانە زۆر بە ڕاستمە.بە دڵخۆشبوونی نازە، دڵخۆشبووم، سۆز و ڕۆز نووستبوون، ماچم کردن، ئەو شەوە جیاواز لە شەوانی دی، وێڕای ماندوبوون لە خۆشیا تا درەنگ نەنووستین.

# بازاڕ

بەیانی زۆر بە زوویی چووین بۆ ماڵی (فایەق و ئەحمەد) تا ئەوانیش خۆیان ئامادەکەن، هەر لەوێوە چووینە دوکانی (عەبدولرەحمان)، باڵابەرزێ لاواز، ڕیشێ تەنکی دانابوو، سمێڵی کەمکردبووەوە، زۆر ڕێزی لێگرتین. وریا وتی کارمان پێتە.وتی بە سەرچاو، ئینشەڵڵا کارتان خێری پێوە دەبێت.وریا وتی کەلوپەلی ناوماڵمان هەیە، دەمانەوێ بیفرۆشین، تۆش هاوڕێی دێرینی ئێمەی، هەر بۆیە بۆ لای جەنابت هاتووین.

– ئینشەڵڵا، دیارە کاری خێرتان بە دەستەوەیە.

وریا وتی نێوان خۆمان بێ، دەچین بۆ دەرەوە.

– بڵێ ئنیشەڵڵا، پەنا بە خوا، ئیدی خوا کارت بۆ ئاسان دەکات، دەبێ ئێمە بۆ هەموو شتێ هەر ڕوو لە خوا بین.

وتم :ڕاستدەکەی ، بەڵام پەرژین بێ لە ڕووت، خەڵکی ئیمڕۆ بیری ئایینی نەماوە، بە ناو ئایینی ئیسلامەوە چەندین کاری خراپدەکەن.

عەبدولرەحمان : بە خوا قسەکەت ڕاستە.

وریا : دەمانەوێ هەر ئێستە بێی و سەیری کەلوپەلی ماڵی ئێمە و سامان بکەی و نرخێ باشمان پێبدەیت.

- پەلەتان نەبێ، با چاتان بۆ بانگکەم، پاشان دێم سەیری دەکەم و بە دڵی خۆتان نرخ دادەنێم، چونکە ئێوە هاوڕێی دێرین و ئازیزن .
وتم زۆر سوپاستدەکەین، چای ناخۆین، چونکە ئێمە پەلەمانە.
دڵخۆشبووم کەسێ باشمان تووشبووە، موسڵمان و بە ویژدانە.
شاگردەکەی لە دوکان جێهێشت وبە پیکابە شڕەکەی چووین بەرەو ماڵی وریا، لەوێوە بۆ ماڵی ئێمە، بەڵام هەر بە ئینشەڵڵا وسوێند خواردنی زل، ویستی قۆڵمان ببڕێ، ئینجا پێشئەوەی مامەڵەمان لەگەڵ بکات، وا ڕێکەوت بانگی نوێژی نیوەڕۆیدا، کەچی وتی تا نوێژ نەکەم سەیری کەلوپەلەکان ناکەم، ئەم دونیایە هیچ نییە.پاش مامەڵەکردن، ڕێکنەکەوتین وڕۆیشت.
وتم :وریا، بە ناوە موسڵمان و ئایین پەروەرە، بێشەرمانە ویستی بە نرخێ زۆر هەرزان ماڵەکەمان لە دەستکاتەوە.بزانە ئەم بارودۆخە چیی لە خەڵکی کردووە، بۆ پارەو نانێ خەڵکی فریودەدا بە ناو موسڵمانێتییەوە، یا بە قسەی خۆش دێتە پێشەوە، تەنیا لە پێناو قۆڵبڕینی هاوڕێکەی.
- هەرچۆنێ بێت، دەبێ خۆمان لەم بارودۆخە ناهەموارە ڕزگارکەین.
وتم :گەر هاوڕێی لەم جۆرەمان هەبێ، زۆر ئەستەمە بتوانین بڕۆین.
- خەمت نەبێ هەر دەڕۆین، گەرخانوەکەی باوکم فرۆشتبێ دەبێ بڕۆین، خۆ هەر ئەم نییە لە بازاڕی کۆنە فرۆشان، دەچین بۆ لای هاوڕێیەکی دیکە.عەسر چووینەوە بۆ دوکانی کۆنە فرۆشان، عەبدولرەحمان وایزانی کەلوپەلەکانی بەو نرخە ئەدەینێ،

بە ڕوو خۆشییەوە وتی ئینشەڵڵا، ڕازیبوونە.
وتم : ئینشەلاّ نەخێر، نرخەکەت زۆر کەم بوو.
وریا :گەر بەو نرخەی تۆ بێ، دەبێ هەر بڵێین دەچین بۆ هەندەران.
دوکانی سامی لە بەرانبەری بوو، هاوڕێی قوتابیەتی من و وریا بوو، بەلاّم مەسیحی بوو.لەبەر چاوی عەبدولرەحمان وتم وریا، با بچین بۆلای سامی، دڵنیام نرخێ گونجاو دادەنێت.
زۆری پێناخۆشبوو، زانی نایدەینێ ولە دەستی چووین، بە ناچاری بە چاوی توڕەبونەوە وتی دیارە قسمەت نەبووە.
وتم: وایە ، بەلاّم ویژدان لە مامەڵەکردن زۆر باشە.
لەبەر چاوی چووین بۆ دوکانەکەی سامی، هەر لە دوورەوە خێرهاتنی لێکردین، یەکسەر چای بۆ بانگکردین، کەوتە باسکردنی یادگارییەکانی سالاّنی خوێندن، دیاربوو زۆر دڵی پێمان کرایەوە.
وریا : سامی گیان، نهێنی بێ لات، دەمانەوێ بچین بۆ دەرەوە، کەلوپەلمان هەیە بۆ فرۆشتن، عەبدولرەحمانی بەرانبەرت هات بیکڕێ، بەلاّم نرخێ زۆر هەرزانی دانا، ویستی قۆڵمان ببڕێ.
سامی:ئەو عەبدولرەحمانە زۆر کەس گلەیی لێدەکا، تەنانەت ئێمەش گلەییمان لێی هەیە، زۆرجار لە کڕین وفرۆشتن، کێبڕکێی زۆر ناشەریفانە دەکات دژی ئێمە، گەر سەرکەوتوونەبێ، دەڵێ: قسمەتە. هەموو پێکەنین.
وتم :ئێستە بە ئێمەشی وت قسمەتە.
وتی :حەزدەکەن کەلوپەلەکان بێننە دوکان وخۆتان بیفرۆشن.

وتم :کاتمان زۆر بە دەستەوە نییە، گەر بکرێ بیکڕی باشترە.
وتی :زۆرچاکە، سبەینێ بەیانی دێم وسەیری دەکەم، نرخی باشتان پێدەدەم، من قازانجم ناوێت.
زۆر سوپاسمان کرد.
وریا: خۆزگەمان بە سالآنی خوێندن، بە ڕاستی قۆناغێ خۆشبوو لە ژیانمان، بەلآم نەماندەزانی.
وتی: ڕاستە ، زۆر ڕاستە.
وتم :ئەو ڕۆژانە ڕۆیی و نایەتەوە، ئێمە دەڕۆین با کاتت لێنەگرین.
وتی بە پێچەوانەوە، زۆر خۆشحاڵبووم، بەلآم نازانم ماڵتان هەر لە شوێن جارانە؟وریاوتی بەڵێ هەر لە شوێن جارانە، سبەینێ بەیانی چاوەڕوانین.وتی پەلەی چییتانە؛ بە ڕاستی هاوڕێ دێرینەکان دەبینمەوە، گەشدەبمەوە.وتمان سوپاست دەکەین، ئێمەش دڵمان ڕوونبووەوە، جارێ بە خوات دەسپێرین.
بۆ بەیانی سامی و وریا لە ماڵی وریاوە دەهاتن، بە پیکابەکەی سامی هاتنە پێش دەرگا، سەیری کەلوپەلەکانی کرد، نرخێ گونجاوی دانا، لە نرخەکەی عەبدولرەحمان زۆر زیاتر بوو.پارەی کەلوپەلەکانیدا وگوتی ئەو ڕۆژەی ویستتان بڕۆن پێمبڵێن، ئەوکات دێم و کەلوپەلەکان دەبەم.دڵم نایە لەبەرچاوی ئەم مندالآنە کەلوپەلەکان بارکەم و هەستیان بریندارکەم.زۆر هەوڵماندا، سوودی نەبوو، چووەوە بۆ دوکان.

وریا: دەفەرموو، سامی چۆن کورێکە و عەبدولرەحمان چۆن قۆڵ بڕێکە!

وتم : بە هەڵە لە ئایین گەیشتووین، ئایین مانای ویژدانە، فێڵ نەکردنە لە خەڵکی و نەخواردنی مافی خەڵکییە، چاکەکردنە، گەر ویژدانت نەبوو، هەر نوێژکە، کاتێ خوا نوێژت لێوەردەگرێ نوێژەکە لە خراپەکاری دووری خستبێتەوە.

وریا :زۆر ڕاستە.ئێستاوا چاکە بچین بۆ ماڵی فایەق و ئەحمەد، بزانین ئەوان ئامادەبوونە یان ماویانە، تۆزێ پەلەیان لێبکەین، دوو ڕۆژی دیکە دەبێ بڕۆین.

ئەو ڕۆژەی بۆ ئێواریێ دەڕۆیشتین، سامی کەلوپەلەکانی برد و پاشان کلیلی دەرگام بۆ خاوەن خانوەکە برد.

# مالآوایی

بەو نیازەی دوای خۆراوا بوون، هەر چوار خێزان لە گەراج کۆببینەوە.(ڕێبوار) ش دوو ڕۆژە ڕۆیشتووە، لەوێ چاوەڕوانە....

بۆ دواجار بە بازاڕدا تێپەڕیم، بە خۆشەویستییەکی زۆر تایبەتەوە هەنگاوم دەنا، هەموو کەسم خۆشدەویست، (بلە شێت)م بینی دەسووڕایەوە، هەستم دەکرد نزیکترین کەسمە، بازاڕەکەمان بە (بلە)وە جوانە، دڵتەنگبووم، ئەم شارە جێدێڵم، چەند کاتژمێرێ دیکە لەگەڵ دایکم و کەسەکانم مالآواییدەکەم، ئەو مالآواییە ببووە کۆسپێ گەورە.

کەسوکاری من و نازە، لە ماڵی براکەم کۆببوونەوە تا نزیك ئێوارە لەگەڵ کەسوکار بووین، کاتی ڕۆیشتنمان نزیك بووەوە، نەمدەزانی چۆن مالآوابوونکەم، لە کێوە دەسپێکەم، بە ڕاستی دەترسام بە تایبەت لە دایکم، چونکە فشاری خوێنی هەبوو، سەیرێ کاتژمێرم کرد، وتم نازە گیان خۆتان ئامادەکەن، بەڵکو دەڕۆین. هەستام وچووم دەستی دایکم ماچکرد، ئەویش باوەشی لێدام، سەرم خستە سەر سینگی، (ئەو سینەی بۆنی تەمەنی شیرە خۆرەمی لێدەهات وەدەیهێنایەوە یادم.دام لە کوڵپەی ئەو گریانە پەنگخواردووەی چەند

ساتێکە، دڵودەرروونی بەستبووم، زۆر گریام، دایکیشم لەبەر گریان هەناسەی تەنگببوو، حەزمدەکرد لە سەر سینگی دایکم بنووم و هەڵنەسمەوە). دایکم زۆر بە کوڵ دەگریا، گەر لە سەر تەرمەکەم بوایە، هەر ئەوەندە دەگریا، هەستا و باوەشیٚ دیکەی لێدام، دەستەکانی وەك قولاب لە پشتم گیر کرد بوو، لێم نەدەبووەوە، ماچ وبۆنکردنمی تێکەڵکردبوو، وەك ئەوەی نامبینێتەوە، هەوڵمدا خۆم لە ئامێزی بکێشمەوە، بەلاّم ئەو پتر دەگریا وهاواری دەکرد، وەك ئەو ساتانە بوو، دەمویست لە سکیدا بێمە دونیاوە.حەزم نەدەکرد باوەشی گەرمی جێبێڵم، بەلاّم چارم نەبوو، هێدی هێدی خۆم دەکێشایەوە، ئۆتۆمبیلی خزمیٚ لە دەرگا چاوەڕوانبوو، سەرکەوتین بەرەو گەراج.
هەر چوار خێزان کۆبووینەوە، ژمارەمان، بە منداڵەکانەوە نۆزدە کەس بوو.شوفێرەکان نزیك دەکەوتنەوە، زۆرحەزیان دەکرد بزانن بۆ کویٚ دەچین.وتم وریا وا چاکە بڵێین دەچین بۆ سەردانی (نەجەف)، چونکە سبەی پێنج شەممەیە وکاتی سەردانییە، لە زاڵگەکانیش لێپرسینەوەمان نابیٚ و بێترس دەڕۆین، دوو ئۆتۆمبیلی (جێمسی) مان گرت، بۆ شاری (نەجەف).
کەمیٚ دڵم هێوربووەوە، بە تایبەت لەگەڵ ئەو خێزانانە.لە ترسی ئەوەی ئاشکرا نەبین، زۆر بیرمان لای جێهێشتنی شارەکەمان نەبوو. کە دوورکەوتینەوە وجێمانێشت، لەو کاتە، نامۆیی وغوربەتی باڵیی کێشایە سەرمان.

مانگە شەوێ زیوینی بوو، ئەستێرەکان دەدرەوشانەوە، لە ڕۆیشتندا بووین، ڕێویێ لە شەقامەکە پەڕییەوە، وریا وتی دەزانن ئەوە ڕێوی بوو، پێشینان دەڵێن "گەر ڕێوی بە پیرتەوە بێ، مانای وایە تووشی خێر دەبی".

شەوێ درەنگ گەیشتینە زاڵگەی پێش پایتەخت، یەك كەس وەستا بوو، شوفێرەکە وتی دەڕۆین بۆ شاری نەجەف.زۆر بە ڕووخۆشییەوە بە ڕێیکردین ، گوتی خوا و محمد و عەلی لەگەڵتان بێت، دیاربوو شیعە بوو.

هێشتا بانگی بەیانی نە فەرموو بوو، گەیشتینە شاری (نەجەف)، هەر لەوێوە پاسێ تایبەتمان گرت بۆ سەماوە، هەموو سوار بووین، وریا لە پێشەوە دانیشتبوو، شوفێرەکە بە وریای گوت کاکە بۆچی دەچن بۆ شاری (سەماوە)؟هەموو بێدەنگبووین، گوێڕایەڵ بووین بۆ وەڵامدانەوەی وریا، دەبێ چۆن وەڵامداتەوە.

– بانگکراوین بۆ ئاهەنگی ژنهێنان.

شوفێر : ئاهەنگی کێیە؟

– ساڵی ١٩٧٥ بە بڕیارێ کوردیان لە کوردستانەوە ڕادەگواست بۆ خواروی عێراق، خزم وکەسی ئێمە بۆ شاری (سەماوە) ڕاگواستران، ئێستە لەگەڵ خێزانی عارەب (ژن بەژن) دەکەن، ئێمەش بەم گەرمە ئەم ڕێیەمان گرتووەتە بەر.شوفێر بە گاڵتە وپێکەنینەوە وتی ئەوا بووینە خزم.بەو وەڵامەی وریا هۆشێکمان هاتەوە بەر.

نزیك شار بووینەوە، نوسراوێکم خوێندەوە، نوسرابوو(بوەستە بۆ پشکنین)، زاڵگەی پێش چوونە ژوورەوەی شار بوو، لە دوورەوە هێمایان بۆ کردین تا بە پەلە تێپەڕبین، دڵم ترسا، وامدەزانی ئاشکرا بووینە ولەو دیوی زاڵگەکە ڕامانەدەگرن، هەموو ترس دایپۆشین،

یەکسەر وریا وتی بۆ ئەڵێ بە پەلە بڕۆن؟

شوفێر: پارێزگاری سەماوە لە دوامانەوەیە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی تێپەڕبێ پەلە لە ئێمە دەکەن.لە دڵەوە زۆر سوپاسی خوام کرد. چووینە نێو شارەوە، لە جامی پاسەکەوە سەیری دەرەوەمان دەکرد، هەموو هەر عەگال لە سەر بوون، لە ناکاو پیاوێ کوردمان بینی، جامانەی بەستبوو، وامدەزانی هەر من دەیبینم، کەچی هەموو وتیان ئەوە کابرایێ کوردە، هەر ئەوەندە نەبوو لە جامەکەوە بانگی بکەین.

هێشتا نەڕۆیشتبووین، دەمانوت دەبێ چەند ساڵی دیکە بگەڕێینەوە کوردستان ، دەبێ کەی لەم ڕژێمە رزگاربین و هەموو خەڵکی بگەڕێنەوە سەر خاك و ئاو و هەوا و زێدی باوباپیران؟!.

نزیك گەراج، لەو شوێنەی دیارییان کردبوو، دابەزین.لە پڕ (ڕێبوار) دەرکەوت، هەموو گەشبووینەوە.خێرهاتنی لێکردین وتی هەر ئێستە پاس دەهێنم ودەچین بەرەو ماڵە بەدوەکە.

پاسی هێنا وسوار بووین، پاسەکە مۆدیل کۆنبوو، زۆر شلۆقبوو، پێدەچوو هەر لە ڕێی بیابان کاری کردبێت.شەقاممان جێهێشت

وچووینە سەر لمی بیابان، لە هەموو لایەکەوە تۆزی لمی بیابان دەهاتە نێو پاسەکەوە، چونکە لە چەندین شوێنەوە کون ودرزی تێدا بوو، تۆزەکە تەواو تەنگی پێهەڵچنین، زۆربە دەکۆکین، گەرچی پاسەکە شڕبوو، بەڵام زۆر باش دەڕۆیشت.

پاش کاتژمێرێ، گەیشتینە ماڵی بەدوەکە، دابەزین و لەو بەرمیلە پلاستیکە گەورانەی ئاویان تێبوو، سەرودەموچاومان شۆری، ئینجا کردیانینە ڕەشماڵێکی گەورەی زۆر ڕەشەوە، دیاربوو تازە دانرابوو،

چونکە پێش چوار ڕۆژ لێی نەبوو.

ڕێبوار :دەبێ هەمووتان لە نێو ئەم ڕەشماڵە دەرنەچن تا ئاشکرا نەبن.

وریا :کێ لەم چۆڵەوانییە دەمانبینێ، ئەم هەمووە بچینە ڕەشماڵەکەوە لە گەرما دەمرین.

ڕێبوار یەکەمجاری بوو تووڕە بێ وبە تووڕەییەوە وتی :

وریا بۆ هاتن؟کە هاتن دەبێ بە هەموو شت رازی بن.

سەرمسوڕمابوو لەو گۆڕانە لە ناکاوەی ڕێبواری قاچاخچی، ئەو ڕێبوارەی زۆر بەڕێز بوو، قسەی خۆشبوو، کەچی وا بە زوویی گۆڕا، دەیانوت قاچاخچیی جێی متمانە نین، تا دەبیتە سەرنشینی لێت دەپاڕێتەوە، خۆی دڵسۆز پیشاندەدا.

خۆراوا بوو، بۆ یەکەمینجارە تاریکی بیابان خۆی بەسەرماندا کێشا بانگی ڕێبوارم کرد وتم دونیا تاریکی کرد، دەرنەچین؟

– ئێستە بە ئەبوجاسم دەڵێم .
ڕێبوار :ئێستە دەربچن، بەڵام بە بێدەنگ.
ئەحمەد :بەم تاریکییە ، لەم بیابانە چیی هەیە؟!
ڕێبوار :گەر تواناتان نییە بۆ هاتن؟حەزدەکەن ئێستەش بگەڕێنەوە.
ئەحمەد: کەلوپەلی ماڵمان هەرزان فرۆشکرد، ئێستە بگەڕێینەوە.
وتم :پێویست بەم مشتومڕانە ناکات، وازبێنن.
هەموو بێدەنگبووین، هەر خێزانە وخواردنی خۆی پێبوو، گەر خواردنمان نەهێنایە زۆر برسی دەبووین، چونکە ئەو ماڵە بەدوە زۆر چاوچنۆکبوون، خواردنیان ئامادە نەدەکرد.
شەو ڕاشکا، ئەستێرەکان پتر دەدرەوشانەوە، تا ئەو کاتە نەمدەزانی هێند ئەستێرە بە ئاسمانەوەیە، وا گەشاوە ونزیکبوون، وامدەزانی ئاسمان شارێکە وبە گلۆپی جوان ڕازاوەتەوە.
مێشوولەی بیابان بێزاری کردین، مندالْ لەبەر ئازاری پێوەدانی مێشوولە دەگریان، ئەبوجاسم زانی مێشوولە ئازارمان ئەدات، ئاگرێ گەورەی کردەوە، بەو هاوینە گەرمە لەو مانگی تەمووزە، لە نزیك ئاگرەکە دانیشتین، تا ڕزگاربین لە ئازاری مێشوولە.
بڵێسە ئاگرەکە تەواوبوو، تەنیا پشکۆی مابوو، مندالْ هەموو نووستبوون وچاوە گەشەکانیان لێکنابوو.ئەبوجاسم جگەرە لە سەر جگەرەی دادەگیرسان، جاروبار سەیرێ دەوروبەری خۆی دەکرد زۆر دەترسا، هەر کاتێ جگەرەی بە دەستەوە نەبوایە، ئەوا بە پەنجەکانی خەریك لووتی دەبوو.ڕێبوار، لە تەنیشتییەوە

دانیشتبوو سەری بۆ قسەکانی دەلەقان، بە گوێرەی دڵ ئەبوجاسم قسەی دەکرد، کە ئەبوجاسم بە ڕێبواری وت چای لێبنێ.بە پەلە قۆرییەکی هێنا (ئاو ، چا)ی تێکرد وخستییە سەر پشکۆکە.لەگەڵ ئەبوجاسم تا درەنگ چامان دەخواردەوە، پاشان هەر یەکەو لە شوێنی خۆمان لێی نووستین.

نزیك بەرەبەیان لە دەنگی (ڕێبوار و سەگوەڕ ) بە ئاگا هاتین، بەو بەرەبەیانە، خستیانینەوە نێو ڕەشماڵ.

قسە کردن لەگەڵ ڕێبوار سوودی نەبوو، دەبوایە بە قسەمان بکردایە بەو شێوەیە، سێ ڕۆژ ماینەوە، بە ڕۆژ لە نێو ڕەشماڵ، بە شەو لەبەر ئاگری (عاگول)و پشقل لە ترسی مێشولە.

ڕۆژێ لەو ڕۆژانە، (دانا) منداڵە تاقانەکەی ئەحمەد، زۆر منداڵ بوو، تەمەنی (٣ – ٤) ساڵ دەبوو، زۆرحەزی بە ڕۆیشتندەکرد، چووە دەرەوەی ڕەشماڵەکە، ڕێبوار، وەك ئەوەی پەلاماری کەسێ گەورە بدا، گرتی بە قۆڵیا وفڕێی دایە نێو ڕەشماڵەکەوە، بە دەنگێ بەرزیش وتی:(پێتاندەڵێم کەس دەرنەچێ)، ئەحمەد شالاوی بۆ ڕێبوار برد، خۆمان گەیاند و نەمانهێشت.وتی: تۆ پیاو نیت، من هەر ئێستە دەگەڕێمەوە.

ڕێبوار : گەڕانەوە نییە، گەر دەگەڕێیتەوە پارەت دابنێ وبگەڕێوە.ئەم قسەیەی کرد و چوو بۆلای ئەبوجاسم.(وریا و فایەق)ش چوون . دەسمکردە ملی ئەحمەد، وتم پێویستە ئارامبین، دان بە خۆمانا بگرین.

چوینەوە نێو ڕەشماڵەکە، (دانا) لە باوەشی گەلاوێژخان بوو، گوێی لـە دەنگمـانبوو، خـۆی گوشـییە دایکییـەوە، گەلاویـژخان هێنـد گریابوو،

چاوەکانی سووربببوون، ڕووی کردە ئێمە وتی ئەمە ئیشی پیاوە، منداڵەکەم تۆقییوە!.

دڵنـەواییمکردن، وتم هەوڵـدەن بـا بنـویٚ، چیبکەین، ڕووی زەمانـە ڕەشبیٚ.

ئەحمـەد دوا مـژی لـە جگەرەکەیـدا وفڕێیدایـە دەرەوەی ڕەشماڵەکـە وبانگی (دانا)ی کرد، بە پەلە هات و باوەشی لە باوکیدا، واقیوڕما بوو، دەترسا، بە زمانە تازە پاراوەکەی جنێوی بە ڕێبوار ئەدا.

(ڕۆز) دەیویسـت لـە ئەحمـەد وەریگـریٚ و ژیریکاتـەوە، دیـاربوو هۆگری ڕۆز ببوو، هەر بۆیە یەکسەر بۆ لای چوو.

وتم :ئەحمەد با بچین بزانین کەی دەمانبەن وپەلەیان لێبکەین.

جگەرەیـەکی داگیرسـاند ودوو مـژی لێـدا، هەناسـەیەکی هەڵکێشـا و وتی قەت لە دڵم دەرناچیٚ.

وریا و فایەق، لەوێوە دەهاتن.وریا وتی ئەحمەد دڵت هیچ نەکات، فایەق دەزانیٚ چیم بە نا ڕێبوار کردووە، بەڵام چییبکەم تەڕنابێت، بە ئـەبوجاسمم وت گـەر سـبەینیٚ نەمانبـەن، دەگەڕێینـەوە ویـەك دیناریش لە دەست ناگرن.

ئەحمـەد:دەسـخۆش، ئێمـەیان لێـرە بەنـدکردووە، هیچیـانیش دیـار نییە.

سێیەم ڕۆژ بوو.بڕیاریاندا پارەکان وەرگرن و عەسر دەربچین بەرەو سنوور.زۆر دڵخۆشبووم، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی دەڕۆین ، بەڵکو لەبەر ئەوەی رزگاردەبین لە (رێبوار، مێشووله، ئاوی سوێر، ئاگری ئێواران، بەند کردنمان، لەگەڵ لوتی ئەبوجاسم)، پارەکانمان برد بـــۆ ئەبوجاســـم.لە دوورەوە هەســـتا، دیـــاربوو زۆر پـــارەی خۆشدەویست. وتی :رێبوار، کاکە ئەحمەد ئاشتکەرەوە.رێبوار بە پەله باوەشی لە ئەحمەددا و ماچیکرد، کەوتە قسەی خۆش .

پاش وەرگرتنی پارەکان و ژماردنی لە لایەن خۆی و رێبوار.خستییە نێو دۆلابێ بچووك کە لە تەنەکە دروسکرابوو، کلیلیدا.

ئینجا ڕووی کردە ئێمە و زۆر داوای لێبوردنی کرد ، کە خزمەتەکەی وەکو پێویست نەبووە ، بەو قسە زلانە، هیچ لە دڵمان نەما.

بە وریا م وت ئای لە دڵی ئێمەی کورد!!(چەند ئازار بدرێین گەر داوای لێبوردنمان لێبکرێ، هیچ لە دڵمان نامێنێ، بەو پەڕی دڵ فراوانیەوە دەبورین. "گیانی تۆڵەمان زۆر کەمە و هەمووومان بەخشیوە بە گیانی لێبوردن").

وریا : گەر مرۆڤ و مرۆڤایەتیت دەوێ، دەبێت وەك ئێمە بێت، بەڵام چیی لە بەرانبەرەکەت دەکەی، بەزەیی و ویژدان و مرۆڤایەتیی نەبێت.

# ڕۆیشتن بەرەو سنوور

خولـەکێ ببـووە مـانگ، کاتـژمێرێ ببـووە سـاڵ، بـۆ گەیشـتنە کـاتی عەسر، دەترسام درۆمان لەگەڵ بکەن.

لە دوورەوە زۆر بە پەلە دەهاتنـەوە، دەمزانـی هـەواڵێکیان پێیـە، کـە گەیشتنەوە، (ڕێبوار) هات ، وتی مژدە ، خۆتـان ئامادەکـەن، ئێستە بە ڕێتـان دەکـەین.ئەبوجاسـم وتـی هـەر جاری خێزانـێ بچـێ بـۆ ئـەو بەرزییەی لێرەوە دیارە.

یەکەم خێزان ئەحمەد ڕۆیشت.دوا خێزان ، خێزانی من بوو. هـەموو گەیشتینە شوێنی دیاریکراو.ئاوێ رووبار ئاسا، لە لایـەن رژێمـەوە، بـۆ دەوارنشـینەکانی بیابـان دروسـتکرابوو.فایەق وتـی چـەن رۆژە ئێمە لێرەین، بۆ پێیان نەگوتووین ئەم ئاوە هەیە.

ئەحمەد:هیچ کاتێ چاوەڕوان شتی باش مەبە لەم جۆرە کەسانە.

لەوبەر ئاوەکە، پیکابێ (دەبڵ) قەمـەرە وەسـتابوو، چاوەڕوانبوو، بە بەلــەمی تایبــەت پەڕینــەوە، شــوفێرەکە و ڕێبــوار، نهێنییــان گۆڕییەوە.

هەر نۆزدەمان لەو پیکابە جێی خۆمانکردەوە وکەوتینە بڕینی ڕێ، زۆر تیژ دەڕۆیشت ، بە تۆزی لمی بیابان سەر و دەموچاومان سواخ

درابوو، جاروبار لەبەر تاسە، هێواشی دەکردەوە دەکەوتینە نێو گەردەلوولێکی لماوی، گەر ژن و منداڵە بچووکەکان لە پێشەوە نەبوونایە دەخنکان. لە ناکاو پیکابەکە وەستا، وەك ئەوەی کۆپتەرێ بنیشێتەوە، کەوتینە نێو لێشاوێ لە تۆزو گەردەلوول.

دوو بورغوی تایەی پێشەوەی پیکابەکە، سیلاکبوو، لە تایەکانی دواوە، بورغویان هێنا و بەستیانە تایەی پێشەوە، دەسمانکردەوە بە ڕۆیشتن تا شەومان بەسەرهات. تاریك ، کەشو هەوا فێنك، تۆزی پاش پیکابەکە باش دەرنەدەکەوت، دەم و چاوەکان بە تەواوی دیار نەمان و سواخدران. دیسانەوە وەستا، ئەم جارە هەر دوو تایەی پێشەوە سیلاکبوو و چارەسەری نەما. وریا و شوفێرەکە ، چوون بۆ دەوارنشینەکانی ئەو دەڤەرە، بۆچارەسەری گرفتەکەمان.

شەو درەنگی کرد، کزە بایەکی ساردی دەهات، لەبەر سەرمای بیابان خەومان نەبوو، هیچمان پێنەبوو، ئاسمان ببوو بە لێفەمان و لمی بیابان بە دۆشەکمان، منداڵ لەبەر سەرما خۆیان نووساندبوو پێمانەوە، ئێمەش وەك بێچووە کەنگەر لە ئامێزمان گرتبوون.

زۆر درەنگیکرد، هەر نەهاتنەوە، زۆردەترسام لە مەفرەزەی ئەمن و ئیستیخبارات، پیاو خراپان، گەلە گورگی بیابان. من و ئەحمەد بە هێمنی گفتوگۆمان دەکرد، ئەوانی دی کەوتنە نێو خەوەوە، مەگەر جاروبار، یەکێ لە گەستن و پێوەدانی مێشوولە بە ئاگا بهاتایە، بەڵام گەلاوێژ نەنووستبوو، لە نزیك ئێمەوە بوو، وتی لەو کاتەوەی نا ڕێبوار (دانا)ی ترسانووە، لە نێو خەوا رادەچڵەکێ و هەستی

پێدەکەم لاوازبووە.ئەحمەد وتی چییبکەم ژنەکە، وا رزگاربووین لە نا ڕێبوار، بگەینە شوێنی خۆمان دەیبەینە باشترین نەخۆشخانە.
نزیکی بەری بەیان بوو، لە دوورەوە گوێمان لە دەنگی ئۆتۆمبیل بوو،
دوو دڵی کردم ، وتم : ئەحمەد، دەبیٚ وریا و شوفێرەکە بن؟
– بە دڵنیاییەوە، چونکە لە مێژە ڕۆیشتوون.
تەواو نزیکبوونەوە ، خۆیانبوون، بە پیکابیٚ (دەبڵ) قەمەرەوە هاتن، تا پیکابەکەیان چاککرد، دونیا تەواو ڕووناکبووەوە.
بە هەردوو پیکابەکە، چووین بۆ ماڵی ئەو بەدوەی کە هاتبوو لەگەڵ وریا و شوفێرەکە.مۆرکی بەدویان پێوە دیاربوو، چونکە دڵفراوان بوون، زۆر بەڕێزەوە خێرهاتنیان لێکردین.لە ئاوی وشترەکان خۆمان پاککردەوە، بە سەرسوڕماوییەوە تەماشای وشترەکانمان دەکرد، چونکە یەکەم جاربوو وشتر لە نزیکەوە ببینین.
رۆز وتی بابە گیان، ئەم ئاژەڵە چیی پێدەڵێن؟!!
– ئەمە وشترە، ئاژەڵیٚ هێمن و لەسەرخۆیە.ئازاری کەس نادا.
پاش پشوودان و نانخواردن، ئەمجارەیان بە پیکابەکەی دی، زۆر بەڕێزەوە بە ڕێیان کردین.بەرەو سنوور دەڕۆیشتین، نوقمی تۆزی لمی بیابان بوینەوە، گەر مەفرەزەش لە دوامانەوە بوایە، نەدەبینراین.نزیک نیوەڕۆ ، لای دەواریٚ وەستا ، لە دوورەوە بە ئامۆزا، ئامۆزا ، باوەشیان بۆی گرتبوەوە، زۆر ڕێزیان لێگرتین.
پاش پشوودانیٚ، سواربووینەوە و دەسمانکردەوە بە ڕۆیشتن.

شوفێرەکە پێی لە بەنزین نابوو، تەنانەت لە تاسەکانش هێواشی نەدەکردەوە، تا گەیشتینە نزیك ئێوارە، لە دوورەوە دەواریٚ ڕەش دەرکەوت، کە نزیکبووینەوە، چەندین ڕەشماڵبوو، لەوێدا وەستاین. ئەم ماڵە بەدووە، شێخی عارەب بوون، چەندین ژن و پیاو هاتن بەرەو پیرمانەوە.

سەریانسوڕما، نۆزدە کەس لە نێو ئەو پیکابە بچووکە بووین .ژنان ، ژن و منداڵەکانیان بۆ دیوی ژنان بردن، ئێمەی پیاو بۆلای حەوزیٚ بردیانین، پڕ لە ئاو بوو، چوار دەوری بۆڕی بوو، وەك حەوزی مزگەوتەکانی لای خۆمان وابوو، پاشان چووینە دیوەخانی شێخ. پیاویٚ چوارشانەی بالاْ بەرز، ڕیشیٚ تەنکی ماشوبرنج، جلیٚ عارەبی تەواوی لەبەرکردبوو، لە دوورەوە باوەشی بۆ کردینەوە، یەکسەر قاوەیان بۆ هێناین ، زۆر ڕووخۆشبوو بە تایبەت کە زانی کوردین و غەریبین، چەن ژن و پیاویٚ لە دەرەوە ، خەریك سەربڕینی مەڕ و چێشت لێنان بوون. شێخ دەیزانی بە نیازی ئەو دیوی سنوورین ڕووی کردە شوفێرەکە وتی:

بۆ کویٚ دەیانبەن، کەس وەرناگرن ودەیانگێڕنەوە، گوناهبار دەبن، چونکە ئەمانە هەژار و غەریبن، ژن و منداڵیان لەگەڵدایە.

شوفێرەکە :یا شێخ ، هیچی لێنازانم، بە پیکابی ئەبوجاسم هاتبوون.

، شەو پەکیان کەوتبوو، داوایان لێکردم بیانگەیەنمە سنوور.

شێخ :زۆر بە داخەوە، لە خێڵمان کەسی وەك(ئەبوجاسم)ی هەیە، چۆن ویژدانی دیڵیٚ ئەم جۆرە کارانە ئەنجامدا.

توورە دیاربوو، زۆری پێناخۆشبوو، ڕووی تێکردین، وتی:

گەر بە قسەی مامی خۆتان دەکەن ناڕۆن، چونکە وەرناگیرێن وسنووورداش دەکرێن، گەر بە قسەمکەن، دوا پارەتان لە ئەبوجاسم وەردەگرمەوە، بەلاّم ئێمە رازی نەبووین، وتمان هەوڵدەدەین سنووورداشمان نەکەن.

– ئارەزووی خۆتانە، بەلاّم دڵنیام ماف پەنابەرێتیی بە کەس نادەن حەز ناکەم ژن و منداڵتان ماندوو بکەن.

ئەحمەد : مامە گیان، دەزانین تۆ لەبەر بەزەیی و دڵسۆزیتە، بەلاّم ئێمە لە شوێنیٚ زۆر دوورەوە هاتووین، ئەم شوێنە، دوا شوێنە و ماوەیەکە خەون بەو دیوی سنوورەوە دەبینین.

شێخ : ناتوانم زۆرتان لێبکەم، بە ئارەزووی خۆتان بکەن.

قسەکانی، سەر و دڵی گرتین، بێئومێدی کردین.دوا پارووی نیشتیمان لە دوا ماڵی دەوارنشینەکان بوو.پاش نانخواردن، ویستمان مالآوایی بکەین، دووبارە شێخ داوای لێکردین نەڕۆین، وتم مامە شێخ، گەر چارمان هەبیٚ، ڕێی هاتونەهات ناگرینەبەر، شێخ هەناسەیەکی هەڵکێشا، زۆر بەڕێزەوە بە ڕێیکردین.جێی سەرسووڕمان بوو، ئەو خێزانە زۆر پەرۆشبوون، وەك نزیکترین کەس وا بوون، بیرئەوەمان نەدەکردەوە کە هاونەتەوەنین.

پیرێژنیٚ لە تەمەن دایکم، دەگریا و دەیوت توخوا مەڕۆن، دوایی لە ڕیٚ دەکوژرێن، بەلاّم ئێمە هەر سووربووین لە سەر ڕۆیشتن، سواری پیکابەکە بووین، تا دوورکەوتینەوە دەسمان بەرزکردبووەوە و مالاّواییمان لێکردن .

زۆر ڕۆیشتین، دایکم بینی ، باوەشی کردبوەوە و دەیوت بگەڕێنەوە، کوڕەکانم بگەڕێنەوە، بە قسەی ئەو پیرێژنە وشێخ بکەن، بگەڕێنەوە.

وشەی "گەڕانەوە بۆ باوەشی گەرمی نیشتیمانی دایك، زۆر پیرۆز وخۆشەویست بوو، بەلاّم دەردی هەژاریی وبرسێتیی گرانتربوو". لە پڕ پیکابەکە تاسەییٚ گەورەی کرد، نزیکبوو وەرگەڕیٚ، وەستاین، هەموو ئەبلەق ببووین، دیسانەوە، دەسمانکرد بە ڕۆیشتن، دەنگیٚ لە پیکابەکە دروست بوو، چونکە تاسەکە ئەگزۆزی تەقانبوو، بە هۆی چۆلی بیابان، پاکی وفێنکی کەش وهەوا، دەنگەکە پتر بلاّودەبووەوە، شوفێرەکە ڕایگرت ، وتی نزیکبووینەتەوە لە سنوور، سەربازگەکان لێرەوە زۆر نزیکن، گەر گوێیان لەم دەنگە بیٚ زۆر بە ئاسانی دەکەوینە بەردەستیان.وتم گەر سنوور لێرەوە نزیکە، خۆمان بە پیٚ دەڕۆین.شوفێرەکە دیاربوو حەزیدەکرد، وتی زۆر نزیکە.

فایەق: ئێمە پارەمانداوە ، دەبیٚ بمانگەیەنیٚ.

ئەحمەد :با ڕێیەکەمان پێبلیٚ خۆمان دەڕۆین، کورد وتەنی "با ڕیسەکەمان نەبیٚ بە خوری" .

وريا : منیش پێمباشه، با شوفێرەکە ڕێمان پیشاندا چۆنی بڕۆین.
وتم :کاکی شوفێر، دەتوانی ڕێیەکەمان بۆ دەسنیشانکەی؟.
زۆری پێ خۆشبوو وتی:
ئەو گڵۆپە کزانە دەبینن، گڵۆپی سەربازگەی خۆمانن، ئەو گڵۆپە بە شەوقانەی، لەو دیوی گڵۆپەکانی خۆمانەوەیە، ئەو دیوی سنوورە، دەبێ بگەن بەو گڵۆپە بە شەوقانە، چونکە ئەو شوێنە سعودییە، بەڵام لە ڕۆیشتن، دوور سەربازگەی خۆمان بڕۆن، کە گەیشتنە سنوور، دوو زنجیرە گردۆڵکەی بەرز، سنوورمان لەگەڵ سنووری ئەو وڵاتە جیا دەکاتەوە، کە چوونە ئەو دیووی گردۆڵکەکان، ئەو گڵۆپە بە شەوقانەیە کە لێرەوە دیارن.
نهێنیی لەگەڵ وریا گۆڕییەوە کە ئێمەی گەیاندووە.تەواو پیکابە دوورکەوتەوە، تەنیا دەنگ، دەنگی ئەگزوزە تەقیوەکە دەهات بە گوێماندا هێدی هێدی ئەو دەنگەش نەما.
مانگ بە سەرمانەوە زۆر نزیك دیاربوو، ڕووناکی دابووە رووی تەختی بیابان، کە تەماشام کردن ئەو دیمەنە وەك خەونێ دەهاتە پێشچاو، لە بیابانێ ، نۆزدە کەس لە پیاو، ژن و منداڵ جێهێڵراوین و تەنیا ئەستێرە و مانگ کەسمانە و ڕووناکییمانە، وامدەزانی هەرخۆم کەوتوومەتە دەریای خەیاڵەوە، کەچی هەموو لە شوێنی خۆمان وەك دار چەقیبووین، جوڵەمان بۆ نەدەکرا، زمان وەستابوو، هیچی پێدەرنەدەبڕا.بە خۆم هاتمەوە، وتم براینە، فەرموو دانیشن، با پلانێ دابنێین، چۆن بگەینە ئەو گڵۆپە بە شەوقانە، ماوەیەکە

خەونی پێوە دەبینین، بێدەنگ دانیشتین و هەر قسەمان بۆ نەدەکرا، سۆزی نامۆیی لە نێودڵەکان چەکەرەی کردبوو، لێشاویی گریان قورگی داگیرکرد بووین، زمانی لە ئاخافتنی ئاسایی خستبوو، ئەشك لە چاوان قەتیس مابوو.

ئەحمەد : "دۆم بە دانیشتن ماڵی وێرانە" تۆ وتەنی با پلانێ دابنێین.

وتم : قاچاخچییمان لەگەڵ نەماوە، دەبێ ورە بەرنەدەین، پشت بە خۆمان ببەستین، بڕوامان بە خۆمانبێ، شوێنەکە دیارە و پێویست ناکا خۆمان بترسێنین، گەیشتن بەو رووناکییەی ئەو دیو سنوور، لە هەژاریی و ناخۆشیی ژیان ڕزگارمان دەکا، بەڵام ئەوەی گرنگە، بێدەنگی، ڕۆیشتنێ هێمنانە تا لەو سەربازگەیەی ڕژێم تێپەڕدەبین، (من و ئەحمەد لە پێشەوە ، فایەق و وریا لە دوای دواوە، ژن و منداڵ لە نێوەندی هەر دوو لامانەوە)، گەر لە پێشمانەوە شتێکمان بینی، من و ئەحمەد دادەنیشین، ئێوەش بە هێمنی دانیشن، وریا لە دوای دواوە خۆی دەگەینێ، تێیدەگەیەنین چییبووە، ئەویش بۆ دڵنیایی ودڵنـــەوایی، دەگەڕێتـــەوە، خێزانـــەکان تێدەگەیـــەنێ، کـــە دڵنیابووینەوە، دەست دەکەینەوە بە ڕۆیشتن، لە هەڵگرتنی منداڵ، دەبێ گیانی هاوکارییمان بەرزبێ و جیاوازی منداڵەکان نەکەین، گەر ئەم قسانەتان پێباشە، برا بچووکتانم، دەستدەکەین بە ڕۆیشتن.

پێشنیاز و پلانەکەیان پێباش بوو، لەبەر ئەوە بڕیارماندا دەستکەین بە ڕۆیشتن.زۆر هێمنانە ڕێمان دەبڕی، منداڵەکان زۆر ژیربوون، بە

ڕاستی وەك گەورە ڕەفتاریان دەكرد، بڕوام نەبوو، ئێمەین و تەواو نزیكبووینەتەوە لە سنوور وگەیشتنە هەندەرانمان مسۆگەربوو.
گەیشتینە تەنیشت سەربازگەی رژێم، پتر بێدەنگبووین، تەنانەت دەمویست لە هەناسەدان كەمكەمەوە، دەترسام قاچاخچییەكان خۆیان خەبەرمان لێدەن، جگە ترسی بۆسەی رژێم.
زۆر نەمابوو تەواو تێپەڕین، لە دوورەوە تارماییێ هاتە پێشچاوم، وتم دەبێ چاوم رێشكەوپێشكەی نەكردبێ، چاوم نوقان و كردمەوە، وردبوومەوە، تارماییەكە تەواو دەركەوت، چۆكم هێزی لێبڕا، لە شوێن خۆم دانیشتم، كە ئاوڕم دایەوە، هەموو وەك من دانیشتبوون.
ئەحمەد : ئەوە چییە سامان؟!
– تەماشای ئەو تارماییەكە، لەوانەیە پاسەوانبێ، یا بۆسەیان بۆ داناوین.وریا خۆی گەیاند و وتی چییە، بۆچیی دانیشتن؟!!
تارماییەكەم پیشانیدا، وتم بڕۆ پێیان بڵێ هیچ نییە، كەمێ پشوو دەدەین ، چونكە ماندووبووینە، با نەترسن و ورە بەرنەدەن.چوو و بە پەلە هاتەوە، كەمێ دانیشتین، هەر چاومان بڕیبووە شوێنەكە، وتم براینە، گەر چاوەڕوانبین، دونیا رووناك دەبێتەوە، ئەو كاتە یەكسەر ئاشكرا دەبین، وا چاكە زۆر بە هێمنیی بچم بەرەو پێشەوە، وریا وتی من دەچم، وتم نا، وریا گیان من دەچم.
وتی هەر دووكمان دەچین، وتم هەر دەبێ من بچم، باهەر یەكێكمان بفەوتێین، وریا دەستی خستە نێو دەستم، وتی با بەیەكەوە بچین.

بە هێواشی دەستم لە نێو دەستی دەرهێنا، وتم با کات بە فیڕۆ نەدەین.

بە هێمنی دەڕۆیشتم، چەند نزیکدەبومەوە ، پتردەردەکەوت، شێوەی سەربازێ دەهاتە پێشچاو، زۆر ترسام، گوێم لە لێدانی دڵی خۆم بوو، وامدەزانی بەرەو پەتی سێدارە دەڕۆم، نزیکتربوومەوە، دەموت ئێستە دەمبینێ و گوللەیەکم پێوەدەنێ، ورەی خۆم بەرز کردەوە، وتم چیی دەبێ با ببێ، تازە کەوتووینەتە داوەکەوە.

سەربازەکە، قەڵەوێ چوارشانەبوو، جووڵەی نەدەکرد، دەمویست پەلاماری بدەم، یا دەمکوژێ یا دەیکوژم، چەند هەنگاوێ دی چوومە پێشەوە، هەر جووڵەی نەبوو، تەواو نزیککەوتمەوە، قوللەی پاسەوانی بوو، لە سەر ئەو ڕێیەی بۆ سەربازگەکە دەچوو دانرا بوو، دڵم کەمێ هێوربووەوە، بەڵام دەترسام پاسەوانەکە لە نێویدا بێ و خەوی لێکەوتبێ، بە پەلە چوومە بەردەمی، تەماشام کرد، کەسی تێنەبوو، دەوروبەری گەڕام، هیچ کەس لەو دەوروبەرەش نەبوو.

چوومەوە بەرەو قوللەکە، یەکێ هێدی هێدی بەرەو ڕووم دەهات، تەزوویێ لەشی تەزانم ، کارەبا ئاسا وشکی کردم ، وتم تەواو، بووینە داوەکەوە ، کە گوێم لە ناوی خۆم بوو، سەیرم کرد وریایە و هەر بە دوامەوە بووە .

وتم :تۆی، خۆ تۆقیم، وامزانی پاسەوانەکەی.

وتی :مەترسە خۆمم.

وتم :من لێره دەبم، برۆ پێیان بڵێ با بێن، تا زوو لەم ڕێیە ڕزگاربین.
منیش لە نێو قوللەکە لێیدانیشتم، ئەحمەد تەواو نزیکبووەوە، لەو کاتە دەرچووم، حەپەسا، قسەی بۆ نەدەکرا، وتم ئەحمەد گەیشتن.
– چییت پێبڵێم خەریکبوو دڵم بوەستێ، وامزانی پاسەوانەکەی.
بە هێمنی دەستمانکردەوە بە بڕینی ڕێ، تا گەیشتینە نزیک گردۆڵکەکانی سنوور، هێند بەرزبوون، گڵۆپە بە شەوقەکان دیارنەمان و بزربوون، بڕینی زۆر گرانبوو، ببووە چیای حەسارۆست، چونکە زۆرماندووبووین، دوو کاتژمێرێ دەبوو بە ڕێوە بووین، لەگەڵ ئەو ماندووبوونە، بە پەلە بووین بۆ ئەو دیوی سنوور.
بێ پشوودان، ژن و منداڵ و خۆمان، بەو بەرزییە سەرکەوتین، هەر بە خشکە چووینە خوارەوە، زنجیرە گردۆڵکەی دووەممانش بڕی و چووینە سەر شەقام.شەقامێ لەو بیابانە کرابوو، بە گڵۆپی بلاجکتۆری سەر ستونەکان ئەو دەڤەرە وەك ڕۆژ وابوو، گڵۆپی سەربازگەکانی خۆمان لە چاوییەوە زۆر کز وەك چرای دز، کز.
بیرم لە ڕژێمی سەدام کردەوە، کە چۆن ولاتمانی وێرانکردووە، لەگەڵ ئەوەی ولاتێ دەوڵەمەند بە نەوت و چەندین سەرچاوەی بە هێزی ئابووریین، کەچی لە ڕیزی ولاتە هەژارەکانین، خوایەگیان کەی لەم کابوسە ڕزگاردەبین ، کەی؟
لەبەر ماندووبوون، هەموو ڕاکشابووین. نامۆیی دووره ولات لەشی سستکردین، دڵودەروونی خستبووە قەفەزێکەوە، دەبا لە خۆشترین

ولاتی بێگانە بی، گریی نامۆیی، کۆشی خۆشی ناکاتەوە، چۆن بولبولێ لە قەفەزدا بێ دەبا لە خۆشترین باخدا بێ.

بەم خەیاڵەوە چاو نەدەچووقا، رۆز و سۆز لە سەر قۆڵم بوون، نازە لە ژوور سەرم، ئەوانی دی لە دەوروبەر، وامدەزانی هەر خۆم سۆزی نامۆیی لە ڕووم نیشتووە، خستوومییە نێو گێژاوی بیرکردنەوە، کەچیی هەموو وەك من وا بوون.

ئەحمەد :(دانا)ی کوڕم تەندروستی خراپە، وا چاکە خۆمان بگەیەنینە سەربازگەی ئەم ولاتە.

کەوتینە ڕێ بەرەو سەربازگەکە، وێڕای ئەوەی بە سەر شەقامدا دەڕۆیشتین و لمی بیابان نەبوو، بەلام هەنگاوەکان ساردبوون، پەرۆش نەبوون، لەگەڵ هەر هەنگاوێ، دیمەنی شار، گەڕەك ، ماڵ وکەسوکار لە پێش چاوان ون نابوو، جاروبار دڵی خۆمدەدایەوە، دەموت ئەمە ئەو شوێنەیە دەمانویست و هەموو هیوا و ئاواتمان بوو، بەلام هیچ دڵخۆش نەبووم، ئارەقی ماندوو بوون بە هەوای ولاتی بیانیی وشککەینەوە، بیری ئەوەم دەکردەوە ، چ ڕۆژێ دێ و دەگەڕێینەوە !!

## سەربازگەی سعودی

نزیکبووینەوە، سەدای دەنگمان بە ئاسانی دەگەیشتە سەربازگەکە لە ناکاو دووپیکاب نیسان پەترول، لە سەربازگەکەوە دەرچوون ، هاتن بەرەو ڕوومان و پێشیان گرتین، ئێمەش وەستاین.
یەکیان هاتە پێشەوە وتی لە کوێوە هاتوون؟وتمان لە عێراقەوە.
سەیربوو، تەنیا ئەو پرسیارە بوو، بێ پشکنین، سواری پیکابەکانیان کردین بەرەو سەربازگەکە.چووینە سەربازگەکەوە، لە سەری نووسرابوو (**مەرکەز شوعەرا**)، هەستمان نەدەکرد شەوە، بە بلاجیکتۆر ببووە ڕۆژ، ڕووناکی مانگ و ئەستێرەکانی نەهێشتبوو.
تۆزاوی و ماندوو دیار بووین، وەك یەکێ لە نێو جەنگ گەڕابێتەوە وابووین، ژن و منداڵیان برد بۆ شوێنی دەسشۆر و توالێت، پاشان ئێمەی پیاوان چووین .سەربازەکان زۆر بە بەزەیی بوون، بە تایبەت کە زانیان لەبەر هەژاریی و برسیەتیی وڵاتمان جێهێشتووە.
بەو نزیك نیوە شەوە، خواردنی زۆر باشیان ئامادە کرد، کوڕێ (بەنگلادیشیی) چێشت لێنەریان بوو، خوانیان بە چەندین جۆر خواردن ڕازاندەوە، نانی سپییان هێنا، کە لە مێژ بوو نەمانبینی بوو، لە پاشان چەند ترموزێ چا، ئینجا چەندین تەکە پاکەتی

مارلبۆرۆیـان دابەشکرد. بەنگلادیشـییەکە زۆر خزمـەتی کـردین، دەیزانی ئازاریی دەردی غەریبیی وهەژاریی چەند گرانە.
سـەربازێ هـات، ناسـنامەکانی لێـوەرگرتین، فـۆرمێکی بـۆ پـڕ کردینەوە. ژوورێکیان بۆ تەرخانکردین، بە ڕاخەری نایاب، ئامێری فێنککەرەوە، ببووە خۆشترین ژوور، ئێمەی پیاوان لای دەرگاوە، خێزانەکانمان لە سەرووی ژوورەکە، لێڕاکشاین..
شەو ڕاشکا، پرخەپرخ، لەو شوێنە فێنکە ولە سەر ئەو جێیە نەرمە بەو ماندووبوونـەوە، دەنگی دەدایەوە. من و ئەحمەد نزیك یەکدی پاڵمان دابوەوە، ئەحمەد جگەرەی بە جگەرە دادەگیرسان، پەرۆش بوو بۆ کوڕە تاقانەکەی، سەیری لای (دانا)ی کرد و وتی دەزانی (دانا) زۆر لاوازبووە.
وتم: خەمت نەبێ، هەموو لاوازبووینە، نەخۆشین، بەڵام ئینشەڵڵا، چەند رۆژێکە و هەموومان لە بیر دەچێتەوە، ئێستە زۆر ماندووین، جگەرەکەت بکوژێنەوە و هەوڵدە بنووی.
- باشە بە قسەتەکەم، دوا جگەرەی کوژانەوە و فڕێیدا. ماندووبوون و فێنکی شوێنەکە، خەیاڵی لە بیر بردمەوە پێشکەش بە خەوی کردم.
بەیانی زوو، لە دەنگی پێی سەربازەکان بە ئاگا هاتین، دەنگەکە تەواو نزیك ژوورەکەمان بووەوە، ئەفسەرێ، سێ ئەستێرە لە سەر شانی بوو، واتە پلەی نەقیب، لەگەڵ چەند سەربازێ هاتنە ژوورەوە، ئەفسەرەکە، درێژ و لاواز، سوورە، چاوی بە قولاَ چووبوو، چاوەکانی کردبوونەوە، لە ناکاو دەمی بووەوە، دەنگیَ

زیقنی کچانی هەبوو، لەگەڵ تووڕەبوون، ڕەنگی سووری، زەرد هەڵگەڕابوو، دەیوت کێ وتی وەرن بۆ ئێرە؟ولاتەکەمان هیچ کەس بە پەنابەریی وەرناگرێ، ئیمڕۆ لێرە پشوودەن، ئێواری، ڕۆژاوا بوون دەتانگەیەنینە ئەو دیو سنوور، بچنەوە بۆ ولاتی خۆتان.

نەماندەزانی چیبڵێین، ئەم هەواڵە دڵتەزێنە لالی، هێزی ئەژنۆی شکاندین، بەلام لە پڕ زمان کرایەوە.....

وتم:بە ڕاستتانە؟!! چەندین کیلۆمەتر ڕێمان بڕیوە، بە ژن و منداڵەوە، هەروا بە ئاسانی پێماندەڵێن دەتاننێرینەوە، ئەمەی ئێوە دەیڵێن زۆر ئەستەمە.

– لای ئێمە ئەستەم نیەو هەر ئێواری دەتانگەڕێنمەوە.ئەمەی وت و ماوەی کەسی دی نەدا قسە بکات.بە توندیی، سەربازانە سوڕایەوە، بە تووڕەیی و بۆڵەبۆڵ بە سەر سەربازەکان، کە بۆ شەو جێیان کردبووینەوە، چووە دەرەوە.

ورەمان بە تەواوی دابەزی، هیوامان نەما، وتمان خوا گیان ئەم ئەفسەرە دڕندەیە چیبوو بۆمان پەیابوو؟!

ئەحمەد :کوڕینە، نابێ ورە بەردەین، هەر ئێستە دەچین بۆلای ئەفسەرەکە و داوای هاوکاری لێدەکەین تا وەرمانگرێ، ئێمە گەر بگەڕێینەوە، لەو ڕێی بیابانە ، شالاوی مەرگ دەمانپێچێتەوە .

وتم: زۆر ڕاستە، دەچین بۆلای و داوای سۆز و بەزەیی لێدەکەین.

وریا : ورەتان بەرزبێ، یەکدەنگ و یەك هەڵوێستبین زۆر بە ئاسانی وەردەگیرێین، هەموو ولاتێ لە سەرەتاوە جێتناکاتەوە.(کوڕێ کورد

له (كەنەدا) ماڤی پەنابەرێتییان پێنەدا، مانیگرت، دەمی خۆی دروو، ئـەو وڵاتـە، بـە ناچـاری مـاڤی پەنابـەرێتی پێبەخشـی).ئێمـە دەم نادروویـن، بەڵام دەبیٚ یەك هەڵوێستبین.

چەند سەربازیٚ بەرەو ژوورەكەمان هاتن، چەند سینی، ڕازاوە بە چەندین جۆر خواردنیان بۆ هێنـاین، پەرۆش نەبووین بۆ خواردنەكە، پەرۆشبووم بۆ پرسیاریٚ لە سەربازەكەی بكەم و وتم دەبیٚ، ئێمە وەربگرن؟

یەكیٚ لە سەربازەكان وتی:

ئینشـەڵڵا، وەرتانـدەگرن، چـونكە ئێـوە ژن و منـداڵتان لەگەڵدایـە، بەڵام هەوڵدەن بە قسەی خۆش لەگەڵ ئەفسەرەكە مامەڵە بكەن.

– كەس لەم (مەركەزە) وەرگیراوە؟

– چەن مانگیٚ لەمەوبەر زۆر دەهاتن به ئاسانی وەردەگیران.

ئەحمەد : ئەوانەی دەهاتن، ژن و منداڵیان لەگەڵدابوو؟

سەرباز:بەڵیٚ، هەبوو زوگورتی بوو، هەر وەردەگیران.

وریا: ئەوانیش وەك ئێمە كورد بوون، یا عارەب؟

سەرباز :ئەوانەی وەرگیران ، (ڕاكردوو)ی سەربازیی بوون، بڕیاری (گویٚ بڕین) یان لە(سەدام)ەوە بۆ دەرچووبوو، هەندێكیان گوێیان بڕابوو، هەبوو خۆی ڕزگاركردبوو لە گویٚ بڕین، ئەو پزیشكانەی فەرمانی گویٚ بڕینی ڕاكردووانیان پێسپێردرابوو، بەڵام ڕازی نەبوون بە ئەنجامدانی فەرمانەكە ، لە ترسی ڕژێم، بە ژن و منداڵەوە خۆیان گەیاندە ئێرە و وەرگیران.

فایەق :ئێستە ئێمە وەردەگرن، یا نا؟!
سەرباز :ئینشەڵڵا، فەرموون جارێ نانبخۆن.خۆیان چوونە دەرەوە.
وریا :وەرنە پێشەوە بۆ نانخواردن، دڵنیابن وەردەگیرێین،
وتم :وا چاکە ئێمەی پیاوان بچین بۆلای ئەفسەرەکە و پێی بڵێین هاوکارمان بێ و سنووورداشمان نەکا.
سەربازەکان و بەنگلادیشییەکە هاتنەوە، بۆ بردنەوەی سینییەکان، بە سەربازەکانم وت دەمانەوێ سەردانی ئەفسەرەکە بکەین.
سەربازێکیان وتی هەر ئێستە دەچم، پێیدەڵێم .
چاوەڕوانبووین، هەواڵەکەمان بۆ بینێتەوە، زۆری پێنەچوو هات وتی فەرموون بۆلای ئەفسەرەکە.
چووینە ژووری ئەفسەرەکە.دیوەخان بوو، زۆر بە ئاغا دەچوو، چەند سەربازێ پاسەوانی بوون، بە پێوە وەستابوون و سەریان داخست بوو، زۆر سڵیان لێدەکردەوە، سیمای سۆز و بەزەیی بە ڕوخساریانەوە دیاربوو، ئەوەی بەزەیی لە دڵ نەبوو، تەنیا ئەو ئەفسەرە بوو.ژوورەکە ڕاخەری نایابی تیا ڕاخرا بوو، بەو هاوینە گەرمە، زستانی هێنایەوە یادم، هێند فێنککەرەوەی تێدابوو، پاڵی دابووە سەرینەکەی تەنیشتیی ومژی لە نێرگەلە دەدا، لەگەڵ هەڵمژینی نێرگەلەکەی چاویی لێدابڕیبووین، یەك دوو مژی تری لێدا، دەمی لە نێرگەلەکە کردەوە وتی ها، چییتان دەوێ؟
ئەحمەد: دەمانەوێ هاوکارمان بی، ماف پەنابەرییمان بدەی.

خۆی کێشایەوە لە سەر راخەرەکە ودانیشت، بە تورەییەوە وتی هیچ کەس وەرناگرین، چاوەڕوانیی ڕۆژاوابوونمە تا بتانێرمەوە.

ئەحمەد:ناتوانین بگەڕێینەوە، چونکە ژن و منداڵمان لەگەڵدایە، لە ڕێگە زۆربەمان لە برسان و تینوان دەمرین، ولاتی ئێوە رووگەی موسوڵمانانە، گەر ئێوە وەك برای موسوڵمان فریامان نەکەون، ئەی کێ فریامانکەوێ؟ ...ئێوە خاوەن بەزەیی وسۆزن، گەر بەزەییتان بە ئێمەی پیاوان نایە، بە ژن ومندالْ بێ، نەخوازەلاَ، زۆربە نەخۆشین.. هەستایە سەر پێ ، لێمان نزیکبووەوە، وتی دەبێ هەر بگەڕێنەوە، هەوڵدانتان هیچ سوودی نییە، جا نە سەرمان بێشێنن، نە سەری خۆتان.

ئەحمەد :ئێمە بە هیچ جۆرێ ناگەڕێینەوە دەمانەوێ پێوەندیی بە سەرووی تۆوە بکەین.

چاوە بە قولاَ چووەکانی زەقکردەوە، ڕەنگی تێکچوو، یەك زللەی لە ئەحمەددا.من و وریا شالاَومان بۆی برد، بەلاَم چەند سەربازێ پێشیان گرتین، زانی دەستی لێدەکەینەوە، خۆی دوورخستەوە، زۆر ترسنۆك دیاربوو.ئەحمەد وتی ئێمە سلْ لە لێدان ناکەینەوە، گەر بمانکوژن هەر ناڕۆینەوە.ویستی پەلاماربداتەوە، بەلاَم دیسان سەربازەکان پێشیان گرت. سەیربوو، سەربازەکان دەستیان لێنەدەکردینەوە، وەك ناوبژیوانبوون، بە توورەییەوە وتی بچنە دەرەوە.

فایەق :گەورەم، دوو ڕۆژ مۆڵەتمان بدە بمێنینەوە، تا کەمێ گوڕ دەگرینەوە، پاشان دەچینەوە.
ئەفسەرەکە کەمێ ساردبووەوە، بە سەربازەکانی وت ئێستە دەچن ناوی نەخۆشەکان دەنووسن بۆ چارەسەر، لە سەر قسەی خۆیان با دوو ڕۆژ بمێننەوە، پاشان بچنەوە.هەر سێکمان بە زمانی خۆمان لە فایەق تووڕەبووین. تێگەیشت، ئێمە بە قسەکەی فایەق ڕازی نین، بە تووڕەییەوە وتی بڕۆنە دەرەوە.
وتم : فایەق "ڕیسەکەمان مەکە بە خوری".ئێمە لەو سەر دونیاوە هاتووین، گەر یەك هەڵوێستبین، وەرماندەگرن، بینیت کە زانی دەستی لێدەکەینەوە چۆن ترسا و دوورکەوتەوە، گەر دەستی تۆش لەگەڵماندا بوایە، هەڵوێستمان بە هێزتردەبوو.
چووینە ژوورەوە، هەر یەکە و پرسیاری دەکرد.ئەحمەد وتی لە فایەق بپرسن.فایەق وتی گەر ئێستە بڵێن بڕۆنەوە، ژن و منداڵم ئەدەمە پێش و ئەڕۆمەوە.
وریا: گەر وا ترسنۆك بووی بۆ هاتی، ژیانی سێ خێزان، لەگەڵ خۆت بە قوڕ دەگری.
وتی بۆ بە قوڕی دەگرم، من بۆ ئەوە نەهاتووم لێمبدەن.
ئەحمەد :من یەك زللەم لێدراوە، تەنیا لە پێناو ئەم ژن و منداڵانە، چەندی دیم لێبدرێ باکم نییە.
هەموو بێدەنگبووین، بەزەییم بە خۆمان دەهاتەوە، بە تایبەت بە ئەحمەد، بەو تەمەنەیەوە، ئەفسەرێ منداڵکار زللەی لێبدا .

وتم :گەلاوێژخان، کاکە دانا چۆنە؟

وتی :هیچ باش نییە.

– وا دەچم پێیان دەڵێم تا بیگەیەنینە نەخۆشخانە.

چوومە دەرەوەی ژوورەکە، وریا لەگەڵم هات، بە سەربازێکمان وت نەخۆشێکمان بە ئازارەوە پەرێشانە دەمانەوێ بیگەیەنینە نەخۆشخانە، بەڵکو بچی بۆ لای ئەفسەرەکە و پێیبڵێی.

ئەویش بە پەلە چوو بۆ ژووری ئەفسەرەکە. پاش کەمێ چاوەڕوانیی، هاتە دەرەوە وتی دەڵێت، ناوی نەخۆشەکان بنووسن و بیانبەن بۆ چارەسەر. جگە لە دانا، ناوی نۆ کەسی دی نووسرا.

پاش نیو کاتژمێر، ئۆتۆمبیلێکیان بۆ هێناین و سەرکەوتین بەرەو نەخۆشخانە. کلینکێ، لە نزیك مەرکەزەکە بوو، دکتۆرێ هیندیی سەرپەرشتی دەکرد، یەکە بە یەکەی نەخۆشەکانی پشکنی و دەرمانی بۆ دانان .بۆ (دانا)، تەنیا شیتێ پاراسیتۆڵی پێدا تا سەر ئێشەکەی بشکێنێ.

گەڕاینەوە مەرکەز، چەند سینی خواردن دانرابوو، نانیان دەخوارد، بە نابەدڵی و بۆ برسێتیی شکاندن، دەستمان بە نانخواردن کرد.

خۆر لە ئاوابوون بوو، وەك تۆپێ سوور، لەو سەری بیابانەکەوە دیار بوو، ئەو دەڤەرەی سوور هەڵگەڕانبوو، خۆی لە لمەکە چەقانبوو، هێدی هێدی لە ناخیدا خۆی حەشاردا و تاریکی کرد.

دووەمین ڕۆژ بوو، مۆڵەت ڕوو لە تەواوبوون بوو، ئەفسەرەکە لە گۆڕەپانەکە پیاسەی دەکرد، لە پڕ وەستا، دارەکەی ژێر باڵی گرت

بە دەستیەوە، دەیکێشا بە ڕانی خۆیدا ، چەنجارێ تەماشای ژوورەکەی کردین، ئینجا وتی ئێستە دەرچن، ئەو مۆڵەتەی داواتان کردبوو تەواو.

کەسمان دەرنەچووین.سەربازێ هات و وتی بۆخۆتان بە لێدان دەگەیەنن، بڕۆنە سنوور و لەوێ یەك هەڵوێستبن و مانبگرن.

ئەفسەرەکە وەك سەگ لە دوورەوە جنێوی دەدا.فەرمانیدا بە لێدان بمانکەنە نێو ئۆتۆمبیلەکانەوە، بەڵام سەربازەکان تەنها ناوبژیوان بوون، بە هیچ شێوەیێ فەرمانی ئەفسەرەکەیان جێبەجێ نەدەکرد.

سەربازێ وتی سەرکەون با بتانگەیەنینە سنوور، با ئازارنەدرێن.

بە قسەی سەربازەکەمان کرد، وتمان دەچینە سنوور، بەڵام یەکبست

ناچین بەو دیوا تا لیژنەیێ نەیەت بۆ چاوپێکەوتنمان.

سەرمسوڕمابوو، ئاخۆ ئەم دیمەنەی دەیبینم ڕاستە ، چوار خێزان لە نێو ئۆتۆمبیل، ڕەنگی ئاڵوجوانی منداڵان، ئەو ڕووانەی کەمە هیوایەکیان لێنیشتبوو، ئێستە کاڵبوەوە وترس داپۆشی.

تاریك داهات، چووینە نێوان هەر دوو (زنجیرە گردۆڵکەکە)، ئەفسەرەکە لە سەر گردۆڵکەکەوە، بە دووربینی شەو، تەماشای ڕێیەکەی دەکرد، پاش پشکنینی ڕێیەکە گوتی:ئێستە دەسبکەن بە ڕۆیشتن.وتمان گەر بمانکوژن ، لێرە ناڕۆین ، نەیدەوێرا بێتە خوارەوە، سەربازەکانش لە ناخی دڵیانەوە قینیان لێبوو، فەرمانەکەیان جێبەجێ نەدەکرد بۆ سنووورداش کردنمان.

ئەو شەوە تا درەنگ هەوڵیدا، بەڵام بێسوودبوو، بە ناچاری وازی لێهێناین و چووەوە بۆ شوێنی پشووی خۆی.
سەربازەکان گوتیان نەڕۆنەوە، بە قسەی مەکەن، ئێمە هاوکارتانین.
دوو سەرباز مانەوە بۆ پاسەوانی، ئەوانی دی چوونەوە ، پاش نیو کاتژمێر، ترموزێ ئاو، چەند پەتوویەکیان بۆ هێناین.
بەیانی زوو، سەربازەکان خواردنیان بۆ هێناین، زۆر بە وریاییەوە هاوکارییان دەکردین، چونکە لە ئەفسەرەکە دەترسان.نزیك نیوەڕۆ بوو، ئەفسەرەکە هاتەوە، ئەفسەرێ دیکەی لەگەڵ بوو، بە دووربین سەیری دووریان دەکرد، ئاخۆ لەو شوێنەوە ئاوەدانی هەیە یا نییە.
تینی گەرمی خۆرەکە، بێهێزی کردبووین، سەربازەکان بە چاوی بەزەییەوە تەماشایان دەکردین .لە ناکاو یەکێ لە سەربازەکان هاواری کرد، دیار بوو ئەو هاوارە لە دەروون و ویژدان و مێشکی پەنگی خواردبووەوە، وتی: "چۆن دەبێ ئەمانە بە زۆر بنێرنەوە، ئەمانە پەنایان بۆ هێناوین، نەخوازەلا ژن و منداڵ و نەخۆشیان لەگەڵدایە، چ ویژدانێ دەتوانێ ئەمانە بگەڕێنێتەوە، ئێمە موسڵمانمان پێدەڵێن، ولاتی کەعبەی پیرۆزین، دای لە کوڵپەی گریان، بە خوڕ فرمێسکی دەڕژان، دەستی بۆ لای ئێمەوە درێژکرد و وتی ئێستە ئەمانە ئەدەنە دەستی سەدامی خوێنرێژ؟! ئەو سەدامەی، شەوانە بە دووربین سەیرمان دەکرد، چۆن بە دەمی شۆفەڵ ، چاڵی لەم بیابانە هەڵدەکەن، (ژن، منداڵ، پیر و لاو)ی گەلەکەی تێدا زیندە بەچاڵ دەکرد، ئێمەش هیچ دەسەلاتمان

نــەبوو، تــەنیا لــە دوورەوە ئەشــکمان بــۆ هەڵدەڕشــتن، تــۆزێ ویــژدانتانبێ.کـاتی خـۆی موسـڵمانەکان لـە دەسـتی کافرەکـانی قورەیش، پەنایان برد بۆ پاشای حەبەشە کە مەسیحی بوو، ناوی (نەجاشی) بوو، کەچی پاراستیانی، نەیانی دایە دەست کافرەکان".

تــەنیا دەنــگ لــە ســاترەکە، دەنگــی ســەربازەکە بــوو، گریــانی سەربازەکە بوو، زۆر بە کوڵ دەگریا، تەنانەت هاوڕێکانی خۆیشیی بە هێمنی دەگریان، هەمووان سەرمان سوڕمابوو، ئەفسەرەکە ڕەنگی تێکچــوو بــوو، بێــدەنگ وەستابوو.ســەربازەکە بــەو دەربڕینــە دلاّرامبــووەوە، ســەری داخســت و بێــدەنگبوو، ئەفســەرەکەی دی چــرپانییە بنگــوێی ئەفســەرە دڕنــدە و بێویژدانەکــە، لــە دوای ئــەو چــرپاندنە، ئەفســەرەکە ویــژدانی هــەژێنرا، یەکســەر بــە ئــامێرە بێتەلەکــەی دەســتی پێوەنــدیی بــە ســەرووی خۆیــەوە کرد.پــاش وتووێــژکردن لەگــەڵ ســەرووی خــۆی، (دەرکــەوت لیژنــەیێ دێ بــۆ بینینمـان)، دوو ئەفسـەرەکە لەگـەڵ پاسـەوانە تایبەتـەکانی خـۆیـان، چوونەوە بۆ مەرکەز.

چاوەڕوانییمان، بۆ دوا وتە، بۆ دوا هیوا، دیمـەنێ دڵتـەزێنی دابووە لمــی بیابــان و ســۆزی ســەربازەکان.ئەو ســەربازانەی مــابوون، دڵنــەواییان لێــدەکردین ودەیـانوت گـەر لیژنەکـە وەرتـانگریْ ئیـدی ڕزگاردەبن، بڕیارلە دەست ئەم ئەفسەرە نامینێ.

وتم :سـوپاس بـۆ ئێـوە، بـە ڕاسـتی کـارێکی مرۆڤانـەتان ئەنجامـدا.

ئەحمەد : گەر ئەوانیش بڕیاریانوابوو، بگەڕێینـەوە، چیی بکـەین؟

سەربازەکە : ئینشەڵلا وانابێ، بەڵام لیژنەکە وەرتاننەگرێ، ناچار دەبن بە گەڕانەوە.

نزیك عەسربووینەوە، دەنگی هیلیکۆپتەر هات، دەنگەکە نزیك بووەوە، سەربازەکان وتیان لیژنەکە هات.بە ژن و منداڵەوە، چووینە سەر لوتکەی گردۆڵکەکان، هیلیکۆپتەرەکە نزیکبووەوە هێند نزم بووەوە، سەرنشینەکان بە باشی دەبینران، یەکێکیان بە کامێرا وێنەی دەگرتین، چەندێ دەستمان بۆ بەرزکردنەوە وەڵامیان نەدانەوە، پاش وێنە گرتن چوون بەرەو مەرکەز، لەوێ نیشتنەوە. ساردبوونیان بەرانبەرمان دڵتەنگی کردین، تەنانەت وەڵامی ژن و منداڵەکانیشیان نەدەدایەوە.

پاش نیو کاتژمێر، دیسان هاتنە سەرمان ودووجار بە سەرمانەوە سوڕانەوە، ڕۆیشتن.سەربازێ وتی ئەوا ئەفسەرەکە هات، ئێستە بۆمان ڕووندەبێتەوە.

زۆرگۆڕابوو، پێشەکی داوای لێبوردنی لێکردین، کە چیی بەرانبەر کردبووین، پاشان وتی وەرگرتنتان لە دەستی ئەو لیژنەیە بوو، ئەوان بڕیاریاندا لەم سنوورەوە هیچ کەس وەرنەگرن ، مافی پەنابەرێتیی بە کەس نەدەن، بەردەوامبوو وتی گەر بە دەست من بێ وەرتان دەگرم، بەڵام بە داخەوە بێسوودە و ناتوانین هیچتان بۆ بکەین، تەنیا ئەوە نەبێ کە ڕۆژاوابوو، لێرەوە دەتانگەڕێنینەوە بۆ وڵاتی خۆتان، چونکە ئەم ڕێیەمان بە دووربین پشکنیووە، لەم ڕێیەوە بە زووترین کات دەگەنە ئاوەدانی، دوا وتەی (تەنیا

چارەسەر، گەڕانەوەتانە بۆ وولاٌتتان) ئەمەی وت و چووەوە بۆ مەرکەز. دیسانەوە ، ماتومەلولی و ناخۆشی بالٌی کێشایەوە ئەو شوێنە و تەنانەت سەربازەکانیشی گرتبووەوە.

ڕۆژاوا بوو، ئەفسەرەکە هات، ڕوانییە ئەو دیمەنە دلٌتەزێنە، سەرنجی

(دانا)ی باوەشی ئەحمەدی دا، چ نەخۆشە!، ئێستە بەم نەخۆشییە دەبێ بگەڕێتەوە، پەشیمانی بە ڕوویەوە دیاربوو، خۆی بە تاوانبار دەزانی.دەستی دایە دووربینەکەی و تەماشای دووری دەکرد، وتی دەتوانن ئێستە بڕۆن، ڕێیەکە کشومات و ئارامە.

هەموو سەربازەکان هاوکارییان کردین بۆ بڕینی زنجیرە گردۆلٌکی دووەم، ئەفسەرەکەش هاتە سەر زنجیرە گردۆلٌکەی دووەم، مالاٌواییمان لەگەلٌ سەربازەکان کرد، دەگریان، فرمێسك لە چاوانیان بە خوڕ دەهاتە خوار، بەلاٌم هیچ چاوێ، هیچ دەستێ ڕوو لە ئەفسەرەکە نەبوو، هەر بۆیە ویژدانی هەژێنراویی زێدەتر ئازاریدەدا دارەکەی لە ژێر بالٌی نابوو، دووربینەکەی بە سەر سینگییەوە، ڕەق وەستابوو، جولٌەی نەدەکرد، تەنیا سەیری دووری دەکرد.

بە هێمنیی و بێدەنگ ملی ڕێمان گرتەبەر، جاروبار ئاوڕمان دەدایەوە، (ئاخۆ دەبێ لە دوا سات بانگمان نەکەنەوە، پەڕجوویێ دروسنەبێ !!). دەڕۆیشتین، بە ئاسپایی تاریکی بالٌی دەکێشایە بیابان، دوا سەرنجمدا، سەربازەکان لە سەر ساترەکە بوون، بە

یەکرێز وەستا بوون، ئێمەش کەوتینە قوڵایی تاریکی بیابان و دوا جار ئەوانیش لە چاومان ونبوون.

ئەستێرەییێ گەشمان کرد بە نیشان، وەك جاری پێشوو، کەوتینە برینی رێی هاتونەهات و بەیەك ڕیز و بێ دەنگ دەڕۆیشتین، بەڵام ئەمجارە زۆر نزیك نەبووین لە سەربازگەی رژێم، بە پەلە ڕێمان دەبڕی تا زوو بگەینە ئاوەدانی و ڕۆژمان بە سەرنەیەت.زۆر ڕۆیشتین، کەچی هیچ ئاوەدانییێ نەبوو، زۆر ماندوو بووین، وتم: ئەحمەد با پشوویێ بدەین.

وتی: کەڵکی پشوودانمان نییە، (دانا)ی کوڕم زۆر نەخۆشە، با پەلە بکەین و بگەینە ئاوەدانی.

بیابان کشومات، تەنیا دەنگ، دەنگی هەناسەکان بوو لە ماندوویەتیا، ئەستێرەکان ئەدرەوشانەوە، مانگە شەویش بیابانی ڕووناك کرد

بوەوە، کە تەماشای دوورمان دەکرد، ئاوەدانیمان بەدی نەدەکرد. سۆز بە سەر ملمەوە بوو، سەری تەواو خوار ببوەوە و نووستبوو، گرانییێ تەواوی دابووە لەشم.نزیك نیوەشەوبووینەوە، بە تەواوی شەکەتوماندوو ببووین، چ لە برینی ڕێی بیابان، چ لە ترس ئەوەی تووشی دارو دەستەی رژێم نەبین.ئەحمەد وتی زۆر ماندوو بووین، لەبەر ژن و منداڵەکان با کەمێ پشوودەین، پەتووەکانمان لە سەر لمەکە ڕاخست ، لە ترموزە ئاوەکەی لای فایەق، تەنیا بۆ دەم تەڕ کردن، هەر یەکەو کەمێکمان لێخواردەوە و لێڕاکشاین.

چاوم هەڵێنا ئاسۆ ڕوون بوو، بەرەبەیان تێپەڕی بوو، ڕوانیمە دوور، نە ئاوەدانی، نە دەواریێ ڕەش دەبینرا، تەواو ترسام گەر تووشی ئاوەدانی نەبین، چییمان بە سەر دیێ، نەخوازەڵا، ترمۆزیێ لای فایەقە ، نیوەی ئاوی تیاماوە.

دەستە خنجیلەکەی ڕۆژ، لە سەر شانی سۆزی خوشکی بوو، مردنی هەردووکیان هاتە پێشچاوم، تەزووی بە جەستەمدا دەهێنا، ماچم کردن، دڵم بۆیان دەگریا. ئەحمەد بە ئاگا هات وتی سامان بە ئاگای.

وتم بەڵێ، بەڵام تۆ سەیری دەوروبەرکە، هیچ ئاوەدانیی نابینریێ. ئاهێکی هەڵکێشا و سەیری لای دانای کوڕی کرد و وتی زۆر دەترسم (دانا)م لە دەستچیێ، زۆر لاوازبووە و سەرێشەکەی بە تەواوی ئازاری دەدا، ئەمشەو چەندینجار لە هاواری بە ئاگا هاتووم. نەمدەزانی چیی بڵێم، لە سەرنی خۆمەوە، بەزەییم پێدەهاتەوە. لە دەمەتەقێمان، یەکە بە یەکە هەڵدەستا و سەیری چوار دەوری خۆی دەکرد، وایاندەزانی خەونێکە و دەیبینن، کەچی ڕاستەقینەیە. بیابان ئەمسەرئەوسەری دیارنەبوو، زەریاییێ بوو، بەڵام وشکوبرینگ، نۆزدە کەسی لە خۆگرتبوو، نزیک مەرگیش ببووینەوە .

وتم هەستن با بکەوینە ڕیێ، تا خۆر دەرنەکەوتووە و گەرمی نەکردووە.

دەڕۆیشتین وخۆریش هێدی هێدی لە نێو چەقی بیابانەکەوە سەری دەرهێنا، بەرزبووەوە، گەرمییەکەی پەکی خستین ، قوڕگی وشك کردین، لەو کاتە، دوژمنی سەرەکیمان خۆربوو، وامدەزانی تەنیا ئێمە لە سەر ڕووی زەوی ماوین و خۆریش بە دوومان کەوتووە، دەیەوێ بمانفەوتێنێ.

وریا: براینە، با دانیشین پشوودەین.

وریام بینی (هاژە)ی کچی بە سەر ملیەوە، ئارەقێ زۆری کردبوو، نەمتوانی بە قسەی نەکەم، یەکسەر وتم فەرموو دانیشن تا نزیك خۆراوا بوون، چونکە بەم گەرمییە ناتوانین ئەم ڕێیە بڕین، نەخوازەلاّ زۆر بێ ئاوین.یەك پەتوو مابوو، سێیەکەی دی، لەبەر ماندووبوون لە ڕێ فڕێدرا.ڕامانخست و هەموو کۆبووینەوە، (فایەق) ترموزەکەی لای خۆی دانابوو، وتی براینە ئاومان زۆر کەمە، کەس داوای ئاو نەکا، کاتێ ئاو ئەدەمە یەکێ، زۆر لە مەترسیدابێ.

وتم :ڕاستدەکەی، بەلاّم تەنیا منداڵەکان با کەمێ دەمیان تەڕکەن.

ئەحمەد:ڕاستە، کەمێ ئاویان بدەرێ....بە نابەدڵییەوە ڕازی بوو.

تا نزیك عەسر، بە تینی تیشکی خۆرو بە داخبوونی لمی بیابان، بێهێزببووین و تینویەتیی و برسیەتیی تەواو تەنگی پێهەڵچنین. حەزم دەکرد بڕۆین تا زوو بگەینە ئاوەدانی، بەلاّم هێند ماندوو دیار بوون، پەشیمان دەبوومەوە، لە هەمانکات تەنیا چارەسەر ڕێکردنە.

لە پڕ، گەلاوێژ هاواری کرد، (دانا)ی لە ئامێزگرتبوو، ملی ڕاست نەدەبووەوە، دەستەکانی ڕەقببوون، دەڕشایەوە، بێهۆشببوو.

فایەق پشکنی، ئاوی لە ترمۆزەکە دەرهێنا وسەری (دانا)ی فێنك کردەوە، بەڵام بێسوودبوو، تا دەهات بێهۆشتردەبوو.

فایەق وتی وا چاکە بڕۆین تا دەگەینە ئاوەدانی و(دانا) دەگەیەنینە نەخۆشخانە.

هەستاین، زۆر لە سەرخۆ دەڕۆیشتین، هەنگاوەکان بێگوڕبوون، نەخوازەلاَ منداڵەکان، ترسام لەوڕۆوە یەکە بە یەکە نۆرەمان بیٚ بۆ مردن.کاتژمێریٚ ڕۆیشتین و دانیشتینەوە بۆ پشوودان.

وتم : ئەحمەد زۆر بێهێزین، تۆش یەکجاری بێهێزبوویتە.

- چیی بکەم، (دانا) تەواو بێهۆشە.

نەمدەزانی چۆن ورەیان بەرزکەمەوە، تا کەمیٚ خێرابن لە هەنگاونان.

وتم هاوڕێیان، پێویستە بە پەلە بڕۆین، باش دەزانن سەربازە (سعودییەکە) سەبارەت بە دڕندەیی ڕژێم، چیی وت، چۆن لە نیوە شەو، بە دەمی شۆفەلەکان چاڵیان هەڵدەکەن و خەڵکیان زیندە بەچاڵ دەکرد، دڵنیام کوردە ئەنفالکراوەکانی خۆمان بوونە، نازە وتی منیش وا دەڵێم ، چونکە ئەو ڕۆژەی لە دوا ماڵی بەدوو ماڵاوابیمان کرد، پیرێژنەکە دەگریا و تکای لێدەکردین نەڕۆین، دەیوت (دەتانکوژن، ڕژێم ڕقوکینی زۆری لە ئێوەی کوردە، چەند ساڵیٚ لەمەوبەر، لە نیوەشەوان، هاواری منداڵ ، ژن ، پیر و لاو ئەم بیابانەی دەهەژان، ئەو زاڵمە بە شۆفەڵ چاڵی هەڵدەکەن، بە کۆمەڵ

زینده بە چاڵی دەکردن، هاواریان دەنگی دەدایەوە، بەڵام بێباکانە بە دەمی شۆفەڵەکانیان بە لمی بیابان دایاندەپۆشین، دەم ، گوێ و چاو سواخ دەدران ، تەنیا پێکەنینە قێزەون و گاڵتەجاڕییەکەی جەللادەکان و دەنگی شۆفەڵەکان دەمایەوە).وتم کەواتە براینە، با دەسوبردکەین لە ڕۆیشتن، هەوڵدەین هەنگاوەکانمان بە هێزکەین.
منداڵەکان دەمیان کردبوەوە و هەستی ناسکیان لای وتەکانی ئێمە بوو، جاروبار تەماشای دەوروبەری دەکرد، تەنانەت لە سێبەری خۆیان دەترسان ، نزیکتردەبوونەوە لە دایك و باوکیان.
زۆرم پێناخۆشبوو، باسی دڕندێتی ڕژێمم بۆ دەکردن، بەڵام چار نەبوو، بۆ بڕینی ئەو ڕێیە سەختە، دەمویست لە ترسان هەمووان هەنگاومان بە هێزکەین.
فایەق هاتە تەنیشتمەوە و چرپاندییە بنگوێم وتی نەخۆشییەکەی (دانا) زۆر مەترسیدارە، گەر کاتژمێرێ دی چارەسەر نەکرێ، دەیکوژێ، ئەم نەخۆشییە پێوەندیی بە مێشکەوەیە ، لە ترسێ زۆرەوە مرۆڤ تووشی دەبێ بە تایبەت منداڵ، لەبەر ئەوە تا زووە هەستین و بڕۆین.
وتم :براینە با هەستین و پشت بە خوا ببەستین و خۆمان بگەیەنینە ئاوەدانی.بە تیلی چاو سەیری ئەحمەدم کرد، چۆن بە پەرۆشەوە (دانا)ی لە ئامێزگرت و بە زوویی کەوتە ڕێ.
لەگەڵ بڕینی ڕێ، دیسان خەیاڵ بەرۆکی گرتم، ئاخۆ کێ لە پێش کێ دەمرێ، هاتمەوە هۆشی خۆم، سۆز لە باوەشم بوو، سەیرێکیم

کـــرد، ئـــەویش زۆر بـــە بێزارییـــەوە زەردەخەنەیـــەکی بـــۆ کـــردم، چاوەکانیم خوێندەوە، دەیگوت(بۆ واتان لێکردین، بۆچیی؟!!)
گوشیمە باوەشم، دڵم دەگریا وجەرگم دەسووتا، ئەسرین لە چاوان قـەتیس مـابوو، هـەنگاوەکانم بـە هێزترکـرد بـۆ بڕینـی ڕێ، تـا وای لێهـات، چـەن مـەترێ لـە پێشـیانەوە دەڕۆیشـتم، هەسـت و بـیرم، ئاڵودەی ئەندێشە ببوون، ئەمجارەیان ئەنفالکراوان بووە فیلمێکـی ترسناك، (ئاخۆ دەبێ باوکودایك و منداڵەکانیان، چۆن باوەشی تـا هەتاییان بە یەکدییا کردبێ، چۆن لەگـەڵ هـاواردا ، لێشـاوێ لـە لمـی بیابان دەمی سواخدابن، چۆن چاوە گەشەکانیان بۆ دواجار لە تـرس لمـی نێـو دەمـی شـۆفەڵەکان تـۆقێنرابێ، بـۆ دواجـار پێڵوەکـان ئـەو چاوە ئەشکاویانە داپۆشن و نەیکەنەوە)، وامـدەزانی چـەن هـەزار لـە ژن منـداڵ، پـیر و لاو، ڕاکشـاون و ئێمـە بـە سـەریاندا دەڕۆیـن، خـۆم لـەخۆمم دەپرسـی کـێ دەڵـێ وا نییـە؟!هاواری گەلاوێـژ لـە نێـو ئـەو خەیاڵە بە ئاگای هێنام وبە پەلە گەڕامەوە.
ئەحمـــەد (دانـــا)ی لـــە ئـــامێز گرتبـــوو، فرمێســـك بـــە ڕیشـــە مـــاش وبرنجییەکـــەی دەهاتـــە خوارەوە.(دانـــا) دەســـتەکانی بـــە تـــەواوی ڕەقببـــوون وملـــی تـــەواو شـــۆڕببووەوە ســـەر ســـینگی و بـــەرز نەدەکرایـــەوە، ڕشـــانەوەیێ ســـەوزی کـــەفاوی لێهـــاتبوو، چـــەندێ بانگمان دەکرد، وەڵام نەبوو، پاڵمان خست، فایـەق کـەمێ ئاوی بە سەریدا کرد بەڵام بێسوودبوو، سەرنجێ باوکی دا و بۆ دواجارچاوە گەشەکانی بە پێڵوە ناسکەکەی داخست و ماڵاوایی لێکردین.

هاوار و كڵپەی گريان، بيابانی دەلەرزان ، هەموو پەرێشان بووين، فايەق پشكنييەوە، وتی تەواوبووە، خۆيشی دای لە كڵپەی گريان. هەموو دەگرياين، ديمەنێ بوو، ترسناك ودڵتەزێن، (مەگەر لە خەونە ترسناكەكان، ڕووداوی وا دڵتەزێنمان بينيبێ وكتوپڕ بە ڕاچڵەكينێ بە ئاگا هاتبينەوە، داوامان لە خوا كردبێ هەرگيز ئەو جۆرە كارەساتانەمان تووش نەكا و بمانپارێزێ).

كزە با، قژە خاوەكەی دانای دەجولان و تەنيا ئەو جوڵەيەی مابوو، منداڵەكان چاويان بڕيبووە تەرمی دانا ی هاوڕێيان، ڕووی ناسك و پاك وبێگەرديان، بە ترس و نائوميدی ئابلۆقە درابوو.هيچ ئاوەدانيێ نەبوو، تەنيا مانگ و ئەستێرەكان بە ئاگابوون، تا شەو ڕادەشكا، چاوەڕوانيی بينينی دوا تابلۆی دەرد و مەينەتيمان بوون، پاشان هەڵدەپڕوكان و جێيان دەهێشتين.

وريا، (دانا)ی لە باوەش كردبوو، كەوتينەوە بڕينی سەختترين ڕێ، بەڵام زۆر لە سەرخۆ دەڕۆيشتين، بێهێزيمان بێئەندازە بوو، جاری يەكێكمان هەڵمانـدەگرت، سەنگێ گرانی هەبوو، تەواو پەكی خستين، ناچار بڕياری پشوومان‌دا.

فايەق هاتە نزيكمەوە وتی گەر وا بڕۆين وتەرمی دانا بە دەسمانەوە بێ، سبەينێ، بەڵێ هەر سبەينێ، چەند كەسێ ديكەمان لێدەمرێ!دڵم داخورپا، وتم ئەی چار چييە؟ وتی تەرمی دانا بشارينەوە، چونكە يەكجاری هێزی لێبڕيوين.بە هێمنيی وتم ئەی چۆن بە ئەحمەد و گەلاوێژ بڵێين، بە ڕاستی كارێ گرانە.

وریا نزیك كەوتەوە وتی باسی چییدەكەن؟
– فایەق دەڵێ، تەرمی دانا بكەینە گۆڕەوە، ئینجا بڕۆین.
وریا: نیو كاتژمێری دەكەوینەوە ڕێ، گەرهیچ ئاوەدانی بەدی نەكرا، ئەوكات بە ئەحمەد دەڵێین، با ئەویش سبەینێ گلەیی نەمینێ.
تینویەتیی و برسیەتیی تەواو بێهێزیكردین، هەنگاو نەدەنرا. دانیشتینەوە بۆ پشوودان، كەوتینە چرپە لە نێوخۆمان، ئەحمەد هەستی كرد شتێ هەیە، بەو چاوانەی كە مرۆڤ دەیبینی زۆر بەزەیی پیادەهاتەوە، بووەتە جۆگەیێ لە فرمێسك، سەیری كردین ، ئینجا تەماشای كوڕە تاقانەكەی كرد، هەناسەیێ قووڵی هەڵكێشا و جگەرەیەكی داگیرسان.
فایەق وتی وریا بە ئەحمەد بڵێ، خۆیشی دەبینێ بە هۆی (دانا)وە زۆر ماندووین و چەند لە سەرخۆ ڕێدەكەین، با ژیانی هەژدە كەس بۆ كەسێ نەكەوێتە مەترسییەوە، كارەساتێكە هاتووە ، جگە لەوەی ورەی هەمووانی دابەزانووە.وریا یارمەتی لە ئەحمەد وەرگرت و كەمێ دووركەوتنەوە، منیش چووم بۆ لایان.
وریا : ئەحمەد، تۆ لە ئێمە دونیا دیتەتری، ئێمە وامان پێباشە بینێژین، چونكە چەندێ لە پێشچاوان بێ، برینمان ساڕێژ نابێ و ناتوانین ڕێبڕین، زۆریش گوناهە منداڵێ وا بە خاك نەسپێرین، دیارە چارەنووسی لەم خاكەیە، ئینشەڵڵا كە گەیشتینە ئاوەدانی، دێین و تەرمەكەی لەگەڵ خۆمان دەبەینەوە.

سەری داخست ، مژێکی لە جگەرەکەیدا و وتی حەزدەکەم لەگەڵ گەلاوێژ بمێنینەوە لای (دانا)، گەر ئێوە گەیشتنە ئاوەدانی، وەرنەوە بۆ لامان.
وتم : ئێمە نازانین چەند ڕۆژی دیکە بە ڕێوە دەبین، چەندمان لێدەمرێ لە برسان و لە تینوان، هەمووان بەرەو فەوتان دەچین، لەبەر برسێتیی عەگولی بیابان دەخۆین، تینووتری کردووین، گەر ئاوەدانی نەبینینەوە، هەموو بە نۆرە دەمرین، تا کەمێ هێزمان تێدایە چاڵێ هەڵدەکەنین و دەینێژین، ئێمەش بە ڕاستی هاوبەشی خەمتین، بەڵام تازە (کاکە دانا) نایەتەوە نێومان.
ئەحمەد بە کزێکەوە وتی چیتان پێباشە با وابێ، منیش حەزناکەم لەبەر کوڕەکەم، هیچ کەس بفەوتێ. لەو کاتە (فایەق) هات وتی چیتان بڕیاردا.وتم ئەحمەد دەڵێ چۆنتان پێباشە با وابێ.فایەق وتی ئەحمەد زۆرمان پێناخۆشە ئەم بڕیارەماندا، بەڵام چارمان نییە و ئەوە تاقە ڕێگە چارەیە.بە ئاسپایی چەقۆیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و هەر لەو شوێنە دەستیکرد بە چاڵ هەڵکەندن، چونکە لمەکە فشەڵ بوو، بە سەرقاپی تەرموزەکە و چەقۆکە، توانیمان گۆڕێ هەڵکەنین.
گەلاوێژ دەگریا ، هاواریدەکرد و دەیوت قوربانتانبم، لەم خاکی غەریبییە، لە نێو ئەم لمی بیابانە مەینێژن، من دەمێنمەوە، با لەگەڵ (دانا)ی کوڕم سەر بنێمەوە، پاش کوڕەکەم دونیام بۆچییە!چووین تەرمی (دانا) بێنین، دایکی خۆی دا بە سەریا و وتی گەر بمکوژن

نایەڵم جەستەی ناسکوبێگەردیی لەم خاکە وشکوبرینگە بنێژن.
ئەحمەد بە هێمنیی تەرمی دانای لە ئامێز گرت و دای لە کڵپەی گریان، هەموانی تەزان.فایەق بە ئاسپایی (دانا)ی لە دەستە لەرزۆکەکانی باوکی وەرگرت، بەرەو گۆڕەکە بردی، دایکی بە خۆڕنینەوە کەوتبووە دوای فایەق و دەپاڕایەوە نەینێژێ.
هەموو کەوتینە دوای (فایەق)، لەبەر بێتوانایی زۆر لە سەرخۆ دەڕۆیشتین، مەراسیمێ شکۆداربوو، تاجە گوڵینە، (کلاَّو بوو لە قژی ڕنراوی دایکێ، لە فرێدانی دووکەڵی جگەرەی پڕ لە ئاه وحەسرەتی باوکێ ، لە ئەسرینی گەشی منداڵە پاکوبێگەردەکان)، پەتووەکەمان کرد بە کفنی و پاشان خستمانە نێو گۆڕەکەیەوە، لاواندنەوەی ژنان، گریەی منداڵەکان بۆ دوا ماڵاوایی لە دانای هاوڕێیان، دەنگی کڵپەی گریەی ناخی پڕلە حەسرەتی باوکێ، ئاوازێ بە سۆز ودڵتەزێن بوو بۆ مەراسیمی بە خاك سپاردنەکە، ئەحمەد چاوەکانی کردبووەوە، دوا سەرنجی لە بینینی گۆڕی کوڕە تاقانەکەیدا، دایکشی بێهۆش کەوتبوو، فایەق بە پەلە سەروچاوی گەلاوێژی ئاو پرژێن کرد، بە ئاگا هاتەوە، کوڕەکەی لە نێو گۆڕ نرابوو، شالاَّوی دەهێنا و دەیوت (منیشی لەگەڵدا بنێژن، بە جێینایەڵم).هێدی هێدی گۆڕەکەیمان پڕدەکردەوە، گەلاوێژ بە تەواوی تێکچوو، کەوتە جنێویدان بە هەمووان، بە تایبەت فایەق، دەیوت بێویژدان، دانا وا هاوارم بۆ دەکا، دایکە گیان خنکام ، ڕزگارمکە لە دەستیان!!.

پاش بە خاك سپاردن و داپۆشینی دانا، ئەحمەد و گەلاوێژ بێهۆش کەوتبوون، ماوەیەك لە نێو ئەو دیمەنە دڵتەزێنەماینەوە، تا هۆشیان هاتەوە.وتم براینە، وا چاکە بە پەلە بڕۆین تا دەگەینە ئاوەدانی، بەڵکو زوو دێینەوە و تەرمی دانا دەبەینەوە.
وریا سەرقاپی ترمۆزەکەی کرد بە کێلی ژوور سەری گۆڕەکەی دانا تا بزر نەبێ، نازە و چرۆ ژێربالْ گەلاوێژیان گرت، زۆر لە سەرخۆ دەڕۆیشتن، گەلاوێژ دەنگی دانوسابوو، لەبەرخۆیەوە دەیوت وازم لێبێنن، با هەر لە تەنیشت گۆڕی کوڕە تاقانەکەم سەر بنێمەوە، بەڵام چارنەبوو، نەدەبوایە بە قسەیمان بکردایە، منیش قۆڵم لە نێو قۆڵی ئەحمەد نابوو، دەڕۆیشتین.
ئەحمەد: خۆت ماندوو مەکە، (سۆز) ی کچت هەڵگرە، با ماندوو نەبێ. تا تەواو دوورکەوتینەوە، گەلاوێژ ئاوڕیدەدایەوە، واقی وڕمابوو، باوەڕی نەدەکرد کوڕەکەی لە نێو لمی بیابان حەشاردرا.
تەواو گۆڕی (دانا) ونبوو و دیارنەما، نزیك دوو کاتژمێر بەو بێهێزیەمان بە ڕێدا ڕۆیشتین، هیچ ئاوەدانی نەبوو، ئەژنۆکان، هێزیان نەما، پێڵوی چاوەکان ، لەبەر ماندووبوون و فرمێسك ڕژان، بێهێزببوون، چاوەکانی دادەپۆشین، منداڵ هەموو هاواری ئاویان بوو، بە ناچاری هەموو دانیشتین بۆ پشوودان، لە سەرەمەرگدا بووین، حەزماندەکرد مەفرەزەیێ ڕژێم بێ لە مردن ڕزگارمان بکات، چاومان بە چواردەورمان دەگێڕا تا گلۆپێ کزی مەرکەزەکانی ڕژێم ببینین، خۆمان بگەیەنین و هانا بۆ دوژمن بەرین.

بیریّ بە مێشکمدا هات، وتم براینە، گەر وا بڕوا و تووشی ئاوەدانی نەبین، یەکە بە یەکەمان لەم ڕێیە دەمرین، ئەو کاتە لەبەر بێتوانایی، کەس ناتوانیّ ئەویدی بشارێتەوە، گەر ڕازی بن، دوو کەسمان دەڕۆین تا دەگەینە ئاوەدانی، ئەوانی دی پشوودەن تا ئەو دوو کەسە دەگەڕێنەوە. زۆریان پێباشبوو، فایەق وتی کیّ بچیّ؟.

ئەحمەد : من دەچم.

وتم : نەخێر، تۆ زۆر ماندووی، من خۆم تەرخاندەکەم .

وریا : منیش دێم.

بڕیارماندا کەمیّ پشوودەین، ئینجا بڕۆین.ڕۆژ سەری لە سەر ڕانم بوو، بە ئارامی سەریم لابرد و ماچم کرد.وتم وریا با بڕۆین، وا نزیك (دووی شەو) بووینەتەوە.

ئەحمەد : بڕۆن، خوا بتانپارێزیّ.

منداڵەکان زۆر بە دواماندا دەگریان، سۆز دەیوت (بابە گیان جێمان مەهێڵە، هەموو وەك دانا دەمرین).بە دڵێکی تەنگ، بە چاویّ قەتیسماو لە فرمێسك، کەوتینە بڕینی ڕێی نەبڕاوە.

مانگە شەو و ئەستێرەکان ڕووناکییان دابووە ئەو بیابانە بێسنورە، تا دوورکەوتینەوە هەر ئاوڕمان دەدایەوە، کە سەیری پێش خۆمان دەکرد، ئاوەدانییّ بەدی نەدەکرا، کاتژمێریّ بە ڕێوە بووین، ئاوەدانی نەبوو، قوولە پێم ئازاری دەدام، تفێکم لە لمی بیابان کرد، بەڵام یەکسەر پەشیمان بوومەوە و وتم:

(لەوانەیە ژێرمان گۆڕێکی بە کۆمەڵی ئەنفالکراوان بیّ).

وریا: وا دیاره زۆر ماندووی، با پشوو بدەین.

- خەو تەواو لەشی تێکشکانووم، جگە لەوەش، تینو و برسین.

- منیش لە تۆ خراپتر، با کەمێ پشوودەین.

لە شوێنی خۆمان ڕاکشاین، ئەو شەوە کەمێ سەرمابوو، پشتمان نا بە پشتی یەکەوە بۆ نوستن.

(لە دوورەوە تارماییێ دەرکەوت ، ڕوو لە ئێمە دەهات، نزیکبووەوە، بۆم دەرکەوت ئادەمیزادە ، هێدی هێدی دەهاتە پێش، زۆر لاوازبوو, ڕیش سپییەکی بە سالآچوو بوو، لەبەر درێژی کۆمەوە ببوو، جلو بەرگێ کوردی لە بەرا بوو، جامانەکەی لە ملی ئالآنبوو، سەر و ڕیشە سپییەکەی بە تۆزی لمی بیابان بۆز ببوون، چاوەکانی بە قولآ چوو بوون، برۆکانی زیتوتیژ، شەرواڵەکەی لای چۆکییەوە دڕابوو، ئانیشکی لە قۆڵی چۆخەکەیەوە دەرچووبوو، تووکی سینگی لە کراسە بێ قۆپچەکەیەوە، سپی دەکردەوە، سەیری ئەملا و ئەولای خۆی دەکرد، وەك ئەوەی ترسێکی هەبێ، یا لە ژێر چاودێریدا بێ، لێم نزیکبووەوە و وتی کوڕەکەم سلاوت لێبێ.

وتم سەرچاو، فەرموو مامە پیرە ، چییتدەوێ؟

وتی: نامناسی، نازانی من کێم؟

وتم :نە بە خوا مامە گیان، نازانم کێی.

- کوڕەکەم ئێمە ئەنفالکراوانمان پێدەڵێن، بە ژن ومندالْ ، لاو و پەککەوتە وئێمەی پیرەوە، بە کۆمەڵ لە ژێر ئەم بیابانە زیندە بە چاڵکراوین.

- بە ڕاستە مامە گیان؟!جا هەموو خەڵکی کوردستان، بە تایبەت کەسوکارتان، چاوەڕوانیی هاتنەوەی ئێوەن.
- مەگەر چاوەڕوانیی ئێسك وپروسكمان بن، کوڕەکەم ، زۆر زوڵممان لێکراوە، بە دڕەندەترین شێوە ئازاردراوین، ئابڕوی کچانیان بردین، دەنگی گۆڕا، زەنگی گریانێکی پەنگ خواردووی لێئەدا، ئەو گریەیەی سالآنێکە چاوەڕوانیی هەلێکی وابوو بکوڵپێ، فرمێسکەکانی هێند چڕبوون، دڵۆپ دڵۆپ دەژمێردران، ئاهێکی هەڵکێشا، وتی، ڕژێم زۆر دڕندەو بێئابڕوو بوو، بە لچکی جامانەکەی چاوەکانی سڕییەوە کەمێ دڵی هێوربووەوە.
- مامە گیان، بۆ جلەکانت شڕ و دڕاون؟
- کوڕەکەم، وادەزانی پێش زیندە بە چاڵکردن لە خۆشیدا بووینە، جگە لەوەی برسیی وتێنوو بووین، جاروبار جەللادەکان بە قامچییەکانی دەستیان بەردەبوونە گیانمان، لەبەر ئازار، نەماندەزانی هانا بۆ کێ بەرین، بە توندی باوەشمان لە دیواری بەندیخانەکە، لە زەوی، لە یەکدی ئەدا، لە منداڵیش دەستیان نەدەپاراست، چەندین بەو ئازارەوە دەمرن، هەناسەیێ دی هەڵکێشا و ئەمجارەیان زۆر بە کوڵ دەگریا، منیش گریام، گریەوهەنسکمان بۆ یەکدی ئەسەندەوە.
- مامە گیان، داوای لێبوردن دەکەم، ئازارم دای.
چاوەکانی سڕییەوە و وتی بە پێچەوانەوە کوڕەکەم، زۆر لە مێژە حەزم دەکرد، ئازارەکانی دڵم، بۆ کوردێ دڵسۆز باسکەم، کوڕەکەم،

بـرینی هـەرگیز سـاڕێژ نـەبوومان بـرینی ئـازاری ئـابڕوو تکـانی کچـانمانە، بـاوك ، کچـی خـۆی دەکوشـت، تـا نەکەوێتـە دەسـت جـەللادێ ، بـەلاّم مـن دڵـم نـەدەهات وەك باوکـانی دی لـە نیوەشـەوا کچـەکەم بکـوژم، هەمیشـە دەسـتەکانی لـە نێـو دەسـتمدابوو، تـا هەمیشە ئاگاداری بم، شەوێ، جەللادێ ڕەش پێستی لچ ئەستوور، بە لێدانی کێبڵ، بە شەق و زللە، لـە پاش بورانـەوەم، تـوانی دەستی ناسـکی کچـەکەم لـە نێـو دەسـتم دەربـێنێ ، تـا ئێسـتە نـازانم چارەنووسـی کچەکەم کەوتوەتـە کوێـوە، دیسان دایـەوە لـە کوڵپـەی گریـــان، ســـەرم داخســـت، نەمدەویســـت پرســـیاری دی بکـــەم، هێوربووەوە، ئاهێکی هەڵکێشا و وتی کچەکەم زۆر لە دلاّ شیرینبوو، جوانکیلە بوو، ژیر و گوێڕایەڵ بوو، هەر لە تەمـەنی چوارده ساڵی، ئـامۆزا و خـاڵۆزا لـە سـەری شـەڕیانبوو، کەچـی جـەللادی پیسـی چەپەڵ، لێیستاندم، تا بە دەمـی شۆفەڵ لمیـان بـە سـەر و چـاومدا کرد، هەر لە چاوەڕوانیی دوا بینینیی کچەکەم بووم، کوڕەکەم، ئێمـە بووینە سووتەمەنی "ئاگرمان بەرپێی خۆفرۆشـانی ڕووناککردەوە، دوکـەڵمان دڵوجەرگومێشـکی کەسـوکارمانی ڕەشـکردەوە".ئێمـە بووینــە قوربـانی، چـووینە نێـو لاپــەڕەی مێـژووی گەلەکەمانــەوە، پیرۆزیـن زۆر پیرۆز!!شـەهیدین وئاگـاداری هـەموو شتێکین، خۆزگـە لێپرسراوان، ئەوانەی هەمیشە لە گونـدو شاخ لـە خزمـەتیان بووین، بە پیرۆزییمـان بـزانن، ئـاوڕێ لـە کەسـوکارمان بدەنـەوە، وەسیەتبێ کوڕەکـــەم، گـــەر ولاّت ئـــازادبوو، ڕژێـــم ڕوخـــا، ئێسـکوپروســـکمان،

بگەیەنن‌ەوە کوردس‌تان، با ع‌اگول دام‌ان نەپۆشی‌ێ، وش‌تر وئۆتۆمبیلی ڕژێم پتر نەمانپەستێ، دەبا ئێسك و پروسكمان تێكەڵ بە خۆڵە سوورە بۆنخۆشەكەی، گەرمیان و بادینان بێ، بە پێی ئاسكان، خۆڵە سوورەكەی سەرمان بپەستێ، دوا هەناسەی هەڵكێشا و وتی كوڕەكەم، با كاتتان لێنەگرم، نزیك ئاوەدانی بوونەتەوە، دانا ی هاوڕێتان گەیشتووەتە كاروانەكەمان و دڵتان پێوەی نەبێ، هەستە، بە پەلە هەستە تا تووشی دارودەستەی ڕژێم نەبوون، هەستە، هەستە.

ڕاچڵەكیم، تەماشایەكی چواردەوری خۆم كرد، ئارەقم كردبوو، سەر سینگم تەڕ ببوو بەو فرمێسكەی ڕژانبووم، تەنانەت لە خەوەكەشدا لە ئازار و ناخۆشی بووم، وتم خوا گیان ئەو خەونە چیی بوو؟!

بەرە بەیان بوو، كزەباییێكی هەبوو، لە سەرما كوریشكەم كردبوو، كە زیاتر بە هۆشی خۆم هاتمەوە، پرخە پرخی وریا تاقە دەنگبوو لە بیابانەكە، بانگم كرد، وەڵامی نەبوو، كەمێ جوڵانمەوە، پرخەی نەما، جارێكی دی بانگم كردەوە، نوزەیەكی لێوە هات، ئەمجارەیان بە دەنگی بەرز بانگم كرد، لە پڕهەستا و سەرنجی دەوری خۆیدا و وتی ئێمە لە كوێین؟!

– نزیك ئاوەدانی بووینەتەوە.

سەیری چوار دەوری خۆی كردەوە و وتی هیچ نابینم، كەچیی تۆ دەڵێی نزیك ئاوەدانی بووینەتەوە.

– خەونم بینیوە، زۆر باوەڕم بەو خەونەیە.

– وامزانی شتێکت بەدی کردووە.
دەستم نایە پێش دەمی، وتم وسبە، وس.
واقیووڕما، وایزانی شێتبوومە، یەکسەر وتم دەنگی سەگوەڕە.
– سامان، بۆ وا دەکەی، ڕەنگت شێواوە، ئەوە گوێت دەزرنگێتەوە؟
– باش گویٚ بگرە، (هەردووکمان گوێمان لە سەگوەڕەکە بوو)، بە پەلە هەستاینە سەر پیٚ و ڕوو لە سەگ وەڕەکە، هەنگاومانناا.
– دەزانی وریا خەونەکەم هاتەدی.
– خەونەکەت چیی بوو؟
بە ڕێوە دەڕۆیشین و خەونەکەم بۆی باسدەکرد، ئەویش سەیری دەهات، خەونێکی وا، لەم شوێنەی کە چەندین کەس شایەتحاڵن ئەنفالکراوان تێیدا بە کۆمەڵ نێژراون.سەرمسوڕمابوو، چونکە خۆم خەونەکەم بینیبوو، خەونەکەشڵ هاتە دی.وتم پەیمانبیٚ مامە گیان، کە ڕژێم روخا، دەبیٚ ئەم ڕاستییە بدرکێنم، ڕاسپاردەکەت بێنمە دی.
چەند نزیکدەبووینەوە، باشتر گوێمان لە سەگوەڕەکە دەبوو، پەلەتر هەنگاومان دەنا، هێند تیژ و ورد دەمانڕوانییە دوور، وردترین شتمان بەدیدەکرد، نەخوازەلاٚ کە دەواریٚ ڕەش دەرکەوت، وەك تەلاریٚ جوان ودڵگیر دەهاتە پێشچاو، خۆرهەلاٚت، تیشکە سوورەکەی، لمی بیابانی سوورکردبوو، دەوارە ڕەشەکەش سوور دەچووەوە، زیاتر نزیکبووینەوە، لۆری و پیکابیٚ نزیك دەوارەکە وەستابوون، دڵی خۆشکردین و هیوایٚ بوو بۆ ڕزگاربوونمان.

سەگەکان بەرەو ڕوومان دەهاتن، کابرای بەدوو لە پێش خێمەکە وەستابوو و دەستی خستبووە سەر نێوچەوانی، سێبەری لەچاوەکانی کردبوو، لێمان وردەبووەوە، پاشان دەنگی لە سەگەکان کرد نەوەڕن و بگەڕێنەوە، خۆیشی بەرەو پیرمان هات.
چوار شانەیێ کەڵەگەت ، کۆسەیێ زەردباو، دەستی هێنا و تەوقەی لەگەڵمان کرد ، بە دەنگە زیقنەکەی فەرمووی لێکردین، سەگەکان مۆڕەیان لێدەکردین ، بەلام من حەزمدەکرد لە ئامێزیانگرم و ماچیانکەم، دەنگی زولاڵی ئەوان بوو ڕزگاری کردین، هەربۆیە لە پێشچاوم زۆر جوانبوون، بە شێر وپڵنگ دەچوون.
نەماندەزانی هێندە بێهێزین، وەلامی عارەبەکەمان بۆ نەدەدرایەوە، زمانمان لاڵ ببوو، چاومان ڕێشکەوپێشکەی دەکرد، کە گەیشتینە نێو دەوارەکە، ئەژنۆمانش شکا، توانای دانیشتنمان نەمابوو، بێشەرمانە ڕاکشاین، لەو باوەڕەدابووم بە دێو و درنج چووبین، هێند برسیی و تینو و بێتوانابووین، ئەویش هەستیکرد زۆر ماندووین، بە پەلە ئاوی بۆ هێناین، کە بانگی کردین، گوێمان لێبوو، بەلام هێزمان نەبوو هەستین، سەروچاو ودەمی تەڕکردین، کەمێ هۆشمان هاتەوە، دانیشتین و تاسە ئاوەکەمان لێوەرگرت ، بەو ئاوە سوێراوە، ڕیخۆڵە ودەمارەکانمان ئاو درانەوە، گڕی گەرمی دەروونمانی، فێنککردەوە. بە پەلە بەرچاییان بۆ هێناین، زانی تەواو بە هۆش هاتینەوە ، پرسیاری کرد، وتی ئێوە چین و لە کوێوە هاتوون؟!

وتم: ئێمە کوردین، هەر لە سەرەتاوە بە سەرهاتەکەمان گێڕایەوە.
لە پڕ هەستایە سەرپێ و وتی بە پەلە هەستن، پەنجەی بۆ دوور درێژکرد و وتی ئەو پیکابە دەبینن تۆز دەکا و زۆر بە تیژی ڕوو لە ئێرە دێ؟ ئەوە مەفرەزەی پاسەوانی سنوورن، زۆرجار لا دەدەن، نان دەخۆن و دەڕۆن، بەڵام جاروبار سلاوێ دەکەن و تێدەپەڕن، ئێوەش خۆتان و بەخت و نێوچەوانتان.
وتم : گەر بۆ ئێرە هاتن، چارمان چییە؟
بانگی دایکی کرد و وتی ئەم دوانە ببە بۆ ئەو دیو و بیانشارەوە، تا لە مەفرەزەکە ڕزگاردەبین.
پیرێژنەکە بە بۆڵەبۆڵ و توڕەبوونەوە، وتی وەرن، بە پەلە وەرن، کوڕەکەم تووش مەکەن.کەوتینە دوای پیرێژن، لە سوچێ، لێفەیێ پیسی تۆزاوی بە سەرماندا، هەستمان لای دەنگی پیکابەکە بوو، کە بە تەواوی نزیکبووەوە، گوێمان لە دەنگی زیقنیی بەدووەکە بوو، وەلامی سلاوی دانەوە، پیکابەکە تێپەڕبوو، تەواو دوورکەوتەوەو دەنگی نەما .لە ترسان، ئاگامان لە هەناسە سواربوون نەمابوو، بەلام کە لێفەکەیان لە سەر لابردین ، کەوتینە کۆکین، پیرێژن ڕەنگی زەردببوو و زۆر بە مۆنییەوە تەماشای دەکردین.
بەدووەکە، ڕەنگی تەواو تێکچووبوو، دەمی تەتەڵەی دەکرد و دەیوت گەر ئێوەیان لێرە ببینیایە، دەربکەوتایە پارێزگاریتان لێدەکەین و دالدەتان دەدەین ، بە ماڵ و منداڵەوە هەر لە شوێنی خۆمان، زیندە بە چاڵیان دەکردین، چونکە لە مێژە هەڕەشەی ئەم

جۆرە کارانەیان لێکردووین.وتم داوای لێبوردن دەکەین، بووینە سەرئێشە بۆتان، بەڵام گەر بتەوێ بەهەشت بکڕی، ئەو پیکابە یا لۆریەکە دەربکەی و بچین ئەوانی دی لە مردن ڕزگارکەین، تا ئەوانیش بە دەردی ئەو منداڵەی باسم بۆ کردی نەڕۆن. زۆر بە پەلە وەڵامی داینەوە و گوتی: نا.. نا.. نا. بە هیچ شێوەیێ ناتوانم هاوکارتانبم، ئێوەمان لە مردن رزگارکرد، ئاو و نانتان بۆ ئامادە دەکەین و لێمان دووربکەونەوە و بڕۆن فریای هاوڕێکانتان بکەون.وریا وتی چەند پارە دەڵێی، دەیکەینە سەرچاو و دەیهێنین، تەنیا ئەو پیکابەکەمان بۆ دەربکە. پیرێژنەکە گوێی لە مشتومڕمان بوو، بە هەڵەداوان هات، وتی کوڕەکانم، قوڕ مەکەنە سەرمان، نان و دوو دەبە ئاوم بۆ ئامادە کردوون، بیگەیەننە خێزانتان، بڕۆن خوا ئاگادارتان بێ.وریا وتی دایە گیان، تۆ دونیا دیتەی ، ژیانی شازدە کەس لە دەست ئێوەیە، بۆ هاوکاریمان ناکەن و پاداشێکی گەورەی خوایی لە دەس خۆتان دەدەن، جگە لەوەش، چەند پارە دەڵێن بۆتان دەهێنین.پیرێژنەکە وتی هاوکاریمان کردوون، بەڵام بۆ پیکابەکە، ناتوانین.زۆر هەوڵماندا، بەڵام بێسوودبوو. وریا بە کوردی وتی سامان، ئەم سەگبابانە نایەنە ژێربار، وا چاکە بە زۆر پیکابەکە ببەین.وتم نا وریا، نا ، کەمێ پێش ئێستە بێهۆش کەوتبووین، بە ئاو و نمەکیان هاتینەوە سەرخۆ، جگە لەوەش لە دەوریەکە رزگاریان کردین، بیر لەو ڕێگە چارەیە مەکەوە، با نمەك

حەرامىمان پێنەگوترێ، هەر ئێستە نان و ئاوەکە وەردەگرین و زۆر سوپاسیان دەکەین و دەڕۆین.
بەدووەکە زانی زمانمان گۆڕی و لە پیلان دانانین، زۆر ترسا، وتی براکانم، لە ترسی ئەو دەوریانە نەبێ کە بۆ ئەم جۆرە کارانە هەڕەشەیان لێکردووین، هەر ئێستە بە خۆم و پیکابەکەمەوە دێم. وتم بە دایە بڵێ نان و ئاوەکەمان بۆ بێنێ، ئێمە دەڕۆین تا دەورییەکان نەگەڕاونەتەوە. بە وریام وت ناهەقیان مەگرە، ڕژێم زۆر دڕندەیە، ئێمەش بووینایە لە جێیان ، هەر ئەوەندە هاوکاریمان بۆ دەکرا.
خۆر تەواو بەرز ببووەوە و گەرمییەکەی بە تین ببوو، تەنانەت لمەکەی داخکردبوو، زۆر بە پەلە دەڕۆیشتین تا فریای سی و دوو چاو بکەوین کە لە چاوەڕوانیی مەرگ و ئێمە بوون، (ئێمەومەرگ کێبڕکێمانبوو ئاخۆ کاممان زووتر پێیاندەگەین). ڕێیەکی زۆرمان بڕی، ئاوی دەبەکان گەرم ببوون، هێند شوڵقابوون، گەر ماست بوایە دەبوو بە دۆ، بە چواردەوردا چاومان دەگێڕا، ئاخۆ لە چ لایەکەوە دەرکەون. وریا وتی لە هیچ لایەکەوە دیارنین، چار چییە؟وتم زۆر دەترسم لە برسان و تینوان بێهۆش کەوتبن، یا مردبن، ئێمە بەم گەنجێتییەی خۆمان، توانامان لێبڕا، ماڵە بەدووەکە بە توانای هێنایینەوە.
بێدەنگبووین، تا چاو بڕکا دەمانڕوانییە دوور، بێئومێد تری دەکردین، گوێم دەزرینگایەوە، هاواریان دەکرد، (سۆز، بە کزییەوە

چرپانییه بنگوێم، بێتوانایی تەواوی پێوە دیاربوو، دەیوت بابە گیان، فریامانکەون، لە تینوا خنکاین، گەر زوو پێمان نەگەن، مەرگ زووتر پێمان دەگا)، زۆر پەرێشانبووم، لێشاوێ لە فرمێسك، دەمارەکان چاوی ئەستوور کردم، حەزمدەکرد بگریم، تا دەنگ لە گەرومدایە هاواربکەم و قولابی قورگ و مێشکم بقرتێنم، تا کەمێ ئارامدەبنەوە، لەگەڵ بڕینی ڕێ، ئەشك بە لێزمە دەباری، ڕوومەت و ڕیش و لمە تینوەکەی بیابانی تەڕدەکرد.وریا وتی دەبێ دەوریەکان نەیان گرتبن؟وەڵامم بۆ نەدرایەوە، کە تەماشایکردم، زانی زۆر پەرۆشم و کەوتوومەتە گێژاوی خەیاڵەوە، پرسیاری دووبارە نەکردەوە و ئەویش کەوتە ئەشك بارین، یەکەم جاربوو، وریای هاوڕێم بە چاوی پڕ فرمێسکەوە ببینم.وەستام، (وریا)ش وەستا، هیچمان قسەمان بۆ نەدەکرا، باوەشمان بە یەکدیا کرد و دامان لە کوڵپەی گریان، زۆر گریاین، کەمێ دانیشتین و چەند سەرقاپێ ئاومان خواردەوە و کەمێ دڵودەروونمان ئارامکردەوە، وتی سامان گیان، چییمان لەم خێزانانە کرد، بەڵام من تاوانبارم، تۆ ئاگاداری هیچ نەبووی، من تۆشم خستە نێو ئەم گێژاوە نەگبەتییەوە.

– حەز ناکەم وا بڵێی و وا بیرکەیتەوە، تۆ لەبەر دڵسۆزی بە منت وت، باشە گەر پەنابەرێتییان بداینێ ئەو کاتە چیی؟ هەستە، هەستە وریا گیان، با کات بە فیڕۆ نەدەین، ئینشەڵڵا دەوریەش نزیکیان نەکەوتووە.

کەوتینــەوە ڕێ، پــاش کــەمێ لــە ڕۆیشــتنمان، لــە دوورەوە ڕەشاییەکمان بینی، پەلەتر هەنگاومان دەنا تا تەواو نزیکبووینەوە، کەوتنە جوڵە، هەندێکیان هەستانە سەرپێ، کە بە تەواوی ئێمەیان ناسییەوە ودەبە ئاویان بە دەسمانـەوە بینی، گەشبوونەوە کـە لـە مــردن رزگاریــان بــوو، بــەڵام ئــەژنۆیان شــکابوو، نەیانــدەتوانی بـەرەوپیرمان بێن، تـەنیا نوزەیـەکیان لێـوە دەهـات، هـاواری دەنگـی ناسکیی منداڵەکان نەما بوو، بە سەر قاپی دەبەکان ئاومـان دەدانـێ، دەستم دەلەرزی کاتێ ئاوم دەدا بە منداڵەکان، لێوی سوور و ناسکی منداڵـەکان وشـکببوو، گۆشـەی دەمیـان سـپی ببـوو، وەك بێچـوە چۆلەکە دەمیان کردبووەوە بۆ کەمێ ئاوی گـەرمی سوێراو، فرمێسك چـاوەکانی بـەر نـەدەدام، هەسـتم دەکـرد تاوانبـارین بەرانبـەر ژن و منداڵەکان.گەلاوێژ دوور دانیشتبوو، تەماشای دەکرد و پێدەکـەنی، تەزووی بە جەستەمدا هێنا، چونکە پێکەنینەکەی ئاسایی نـەبوو، نازە چرپاندییە بنگوێم و وتی گەلاوێژ شێت بووە، شـەوێ ڕایـدەکرد وباوەشــی گرتبــووەوە، دەیــوت وەرە دانــا، وەرە باوەشــم ڕامەکــە، چـەندجارێ ئەحمـەد و فایـەق دەیهێنانـەوە، بـەڵام ئـەو هەمیشـە لـە دوورمان دادەنیشت و لای ڕاکردنی گرتبوو.

هێــواش هێــواش بــەرەو ڕووی چــووم، وتم گەلاوێــژ، خوشــکە بەڕێزەکەم، فەرموو کەمێ ئاو بخۆوە.پێکەنی، لە پڕ گریـانی تێکـەڵ پێکەنینەکــەی بــوو، وتی(دانــا)ی کــوڕم لەوســاوە بــە دەورتــا دەخولێتەوە، تا کەمێ ئاوی بدەیتێ، تۆ بۆ پشتت لێکرد؟!

وتم:تۆ ئاو بخۆرەوە، ئێستە بۆ (دانا)ش دەبەم.
زەردەخەنەیەکی کرد و وتی وابیّ دەخۆمەوە.
ئەحمەد هاتە نزیکمەوە و مژێکی لە جگەرەکەیدا و وتی دەسەکانتان خۆشبیّ، بە ڕاستی فریامان کەوتن.
بەزەییم پیاهاتەوە، وتم خۆزگە (گەلاوێژخان)م بەم شێوەیە نەئەدی.
بە هەناسەییّ سەردەوە، وتی ئێستە باشە، شەویّ رایدەکرد و باوەشی کردبوەوە، دەیوت (دانا) وەرە ڕامەکە، هاواری بۆ من و فایەق دەکرد و دەیوت (دانا) بگرن، (دانا) بگرن ڕۆیشت.
بانگی هەمووانم کرد، وتم وەرنە لای گەلاوێژخان دانیشن، نۆرەی (نان) خواردنە.
پاش ئەوەی هەموو نان و ئاویان خوارد، کەمیّ هێزیان پەیدا کرد و گەشبوونەوە.فایەق وتی ، ئێستە مەترسی برسێتیی وتینویەتییمان نەماوە، با دەسکەین بە رۆیشتن.
وریا : دەورییە لەم نزیکانە زۆرە، خەریکبوو ئێمەش تووش بین و بمانگرن، بەلاّم مالّی بەدوەکە حەشاریانداین.
ئەحمەد :ڕاست دەکا، با تاریکی بکات، ئینجا دەسدەکەین بە ڕۆیشتن. بڕیارماندا دوای خۆرئاوا بوون بڕۆین.
لەبەر ئەو خۆرە گەرمە دانیشتبووین، هەر یەکە بە خەیالّێکەوە دەیویست کاتەکە بەسەربەرێت، گەلاوێژ بە پەنجە ڕەق و درێژەکەی، بازنەیەکی لە لمەکە دروستکردبوو، پەنجەی تێدا دەخولانەوە و خۆی پێوە خەریك کردبوو، جاروبار زەردەخەنە، هەندیّ جار دلۆپیّ

ئەسرینی دەڕژانە سەر لمەکە، خۆزگەم دەخواست بزانم چیی لە مێشك و دڵودەروونیا پەنگ دەخواتەوە!.
سۆز لە نێوان من و ئەحمەد دانیشتبوو، دەستێکی لە سەر ڕانی ئەحمەد بوو و دەستەکەی دی لە سەر ڕانی من,بەو منداڵییەی سۆزی بۆ ئەحمەد هەبوو، ئەویش هۆگری ببوو، سەیرێکی کردم و تێیگەیانم چۆن سۆز دەستە خنجیلەکەی لە سەر ڕانی داناوە، ماچێ سۆزی کرد و وتی خوا بۆ ئێمەت بێڵێ.وتم کچ ، کچی خۆتە، وتی سوپاس، بە ڕاستی لەو ڕۆژەی (دانا)م لێدابڕاوە، سۆز بەم منداڵییەی هۆگرم بووە، بە ڕاستی دڵی تەواو هێور کردومەتەوە، حەزم نەدەکرد زۆر لە سەر ئەو باسە بدوێم و برینی ئەحمەد بکولێنینەوە، وتم گوێ بگرن، با باسی بەسەرهاتی خۆم و وریا بکەم، لەو ڕێیە چییمان بەسەرهات.دەستم بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکان کرد، تەنانەت باسی خەوبینینم بە پیاوە پیرە ئەنفالکراوەکەوەش کرد.
زۆر بە تامەزرۆوە گوێڕایەڵ بوون، هەر بۆیە لە سەرخۆ و خاڵ بە خاڵ باسەکەم بۆ کردن، تا کاتەکەی پێبەسەربەرین.
فایەق :ئەو ماڵە بەدووە بێویژدان بوونە، چۆن پیکابەکەیان بۆ دەرنەکردن.
ئەحمەد: وا مەڵێ فایەق، ئەم ڕژێمە زۆر دڕندەیە، ئەوان ئێمەیان سەندەوە، نان و ئاوی ئەوانە ئەم هەمووەی لە مردن ڕزگارکرد.
وتم :منیش وا دەڵێم، بە ڕاستی فریامان کەوتن.

لە پڕ وریا هەستایە سەرپێ، وتی سامان ئەوە لۆرییەکە نییە ڕوو لێرە دێت؟!هەموو هەستاینە سەرپێ، وتم خۆیەتی، چونکە لۆرییەکە پێشەوەی سووربوو، بۆدی دواوەی شینبوو، دڵخۆشبووین کە دێن و رزگارمان دەکەن.

نزیکبوونەوە، پیکابێ لە دوای لۆرییەکەوە دەرکەوت، بە تەنیشتیدا تێپەڕبوو، دڵم داخورپا، زۆر ترسام، چونکە ئەو پیکابە بە مەفرەزەکەی بەیانی دەچوو، بۆم دەرکەوت ماڵە بەدووەکە خەبەری لێداوین، پیکابەکە زووتر گەیشتە سەرمان و وەستا، هەر چەکدار بوو، لە پیکابەکەوە خۆیان فڕێدەدا، بە جامانەی سوور، سەرو بەچکیان بەستبوو، تەنیا هەر دوو چاویان دیاربوو، ڕووی لوولەی تفەنگیان لێکردبووین، دەیانوت دەستان بەرزکەن، ئێمەش دەستمان بەرزکردەوە، منداڵەکانیش دەستە خنجیلانەکانیان بەرزکردبوەوە.

لە شوێن خۆمان واقمان وڕمابوو، دەموت ئەمە ئەو ڕۆژەیە لێی دەترساین، لۆرییەکە وەستا، کابرای عارەبی بەدوو بوو، کە ئەم دیمەنەی بینی، ڕەنگی زۆر تێکچوو، زانی تاوانێ گەورەی کردووە. چەکدارەکان زانیان لەو مرۆڤانە نین خراپەکاریمان لێبوەشێتەوە، ئەفسەرەکە هاتە پێش، چوار شانەی ڕەشتاڵە، دانێ زێڕی لە دەم بوو، خاڵێ لە سەر ڕوومەتی کوترابوو، سەیرێکی کردین ، وتی:

ئێوە چیی دەکەن لەم بیابانە؟!

ئەحمەد:لەبەر هەژاریی و نەداریی ڕوومان لێرە کردووە.

لە شێوازی ئاخافتنەکەی ئەحمەد، پرسی، وتی ئێوە عارەب نین، وانییە؟
ئەحمەد: بەڵێ ، ئێمە کوردین.
وتی : ئێوەی کورد چۆن گەیشتوونەتە ئێرە؟!
وتم:ئێمە هەموومان خێزانی هەژارین، داوای هاوکارییتان لێدەکەین
بمانگەیەننەوە نێو شارەکان و ئازادمانکەن.
- منداڵێکی تاقانەم بە هۆی نەخۆشییەکی کوشندەوە لەم بیابانە مرد و ناشتمان، ژنەکەم بە لە دەستدانی منداڵەکەمان شێت بووە، بەزەییتان پێمان بێتەوە، با بچین، گۆڕی کوڕەکەم بدۆزینەوە و دەری بێنین، تا لەگەڵ خۆمان بیبەینەوە.
بێدەنگبوو، تەماشایەکی کردین؛ سەرنجی (گەلاوێژ)یدا تەنیا ئەو دانیشتبوو، پەنجەی بە نێو لمەکە دەگێڕا.بە تووڕەییەوە وتی:
ئێوە تاوانبارن، چۆن بەزەییتان بەم ژن و منداڵانە نەهاتوەتەوە؟.
وریا : تازە کار لە کار ترازاوە و لەبەر هەژاریی ڕوومان لەم ناوچانە کردووە.ژن و منداڵ هەموو هاواریان دەکرد و دەگریان.لەو کاتەدا ویستم پەلاماری چەکی چەکدارێ بدەم، بەڵام نەمتوانی و یەکسەر پەشیمانبوومەوە، لەوەش دەترسام گەر سەرکەوتوو نەبم، هەر لەوێدا هەمووان بکوژن.
ئەفسەرەکە : بڕۆنە نێو لۆرییەکەوە، (نازە و چرۆ) بە دەستە لەرزۆکەکانیان، ئەملاوئەولای قۆڵی گەلاوێژیان گرت و لەسەرخۆ

بەرەو لۆرییەکەیان هێنا، دوا سات ئەحمەد وتی گەورەم، بەڵکو بچین تەرمی کوڕەکەم بدۆزینەوە و لەگەڵ خۆمان بێنینەوە.توڕە بوو وتی: تەرمی ئەوت بۆ چییە، ئێوەش بە دەردی ئەو دەڕۆن.

بە تەنیشت بەدوەکە ڕۆیشتم، وتم ئەی بێویژدان، چییت پێکردین؟ بێدەنگبوو، ڕەنگی تێکچووبوو، دیمەنی وای نەدیبوو، زۆرخۆی بە تاوانبار دەزانی.

چەند چەکدارێ لە دواوەی لۆرییەکە لە سەرمان وەستابوون.

ئەحمەد: براینە، دەڵێین لە (هەولێر)ەوە هاتووین، چونکە هەولێر ئازادە و سەر بە ڕژێم نییە، دەتوانین بڵێین، لەبەر ناخۆشی کوردستان شەڕی براکوژیی و هەژاریی ڕامانکردووە، بەڵام بۆ (کەرکوك) ناتوانین هیچ بڵێین. چەکدارێ بە ئەحمەدی وت بێدەنگ بە، با نەیەم بە قۆناغە تفەنگ پشتت بشکێنم، ئەی تاوانبار.ئەحمەد بە تووڕەییەکەوە سەیری کرد، ئەویش بە تووڕەبوونەوە وتی سەیر مەکە، بە ناچاری سەری داخست و ئاهێکی لە ناخی دڵییەوە هەڵکێشا وهیچ قسەی نەکرد.

لە نێو لۆرییەکە، هەموو نزیکببووینەوە لە یەکدی، چاوەکان بۆ یەکدی دەدوان و زمانیش لاڵ ببوو، نەیاندەهێشت قسەی پێبکەین، منداڵەکان باری دەروونیان زۆر نالەبار بوو، خۆیان نوساندبوو بە دایك و باوکیانەوە، جاروبار بە ترسەوە و بە دزییەوە سەیریێ چەکدارەکانیان دەکرد، لە پڕ چاویان دەشاردەوە، زۆر دەترسام، هەموو وەك (دانا)، تووشی نەخۆشی مێشکبن.

كە گوێم لە سەگوەڕ بوو، زانیم لە ماڵی بەدوەکە نزیکبووینەتەوە.
لۆرییەکە وەستا، هەموو بە سەر یەکدیا کەوتین، دیسان ژن و منداڵ هاواریان کرد، حەزمدەکرد، منداڵەکان خەو بیانباتەوە و چیدی ئەم دیمەنە قێزەونانە نەبینن، جاروبار خۆزگەم دەخواست، وەك (دانا) مان لێهاتایە و گیرۆدەی دەستی دوژمن نەبووینایە.
دەستکرایەوە بە ڕۆیشتن، خۆریش کۆتایی هات وچووەوە چەقی بیابان، خۆی لە بینینمان رزگارکرد، ئەستێرە و مانگیش دەرکەوتن و بوونەوە هاوڕێمان، کز دیاربوون، هەست و ناخۆشی خۆیان بۆ دەردەبڕین.ئەحمەد لە سوچێکی لۆرییەکەوە، نەیدەتوانی جگەرە بکێشێ، سەری لە ئامێزی خۆی حەشاردا، ئەو ئامێزەی هەموو یادگارەکانی (دانا)ی تێدا دەبینییەوە، گەر ئەو ئامێزە ببوایە چەند تابلۆیێ لە یادگارییەکانی کوڕەکەی، ئەوا پیشانگەیێ دڵتەزێنی لێدەردەچوو.
زۆر رۆیشتین تا گەیشتینە نێو شار، چەکدارەکان، جامانەکانیان لە سەروملیان کردەوە، ڕووی دڕندێتییان دەرکەوت کە وێنەی گورگی برسی و دڕندەی بیابانی لە خۆگرتبوو.دەگەیشتینە هەر زاڵگەیێ، بە گۆرانی وبەرزکردنەوەی چەکەکانیان، خۆشی خۆیان دەردەبڕی، کە ئەم چالاکییەیان ئەنجامداوە و ئێمەیان گرتووە.
لۆرییەکە لە شوێنێ وەستا، چەکدارەکان خۆیان فڕێدا ، بە ئێمەیان وت دابەزن، ئێرە جێگەتانە.
لە پێش مەرکەزێ دابەزین، درداینە پێش، نزیکبوینەوە لە ژوورێکی

نزیك دەرگای مەركەزەكە، ئەفسەرەكە وتی، پیاوەكان بكەنە ئەم ژوورەوە.كە وتمان لە ژن ومندالْ جیامان مەكەنەوە. ئەفسەرەكە بە زەردەخەنەییٚ ناشیرینەوە سەیری كردین، ڕووی كردە چەكدارەكان و بە گاڵتە پێكردنەوە وتی:

لەم ئوتێلە، ژووری تایبەت نییە بۆ چوار خێزان؟ پاشان وتی بە خێرایی بیانكەنە ئەو ژوورەوە و دەرگایان لێداخەن، با ئەو دەم و چاوانە نەبینمەوە.

منداڵەكان خۆیان پێمانەوە نوسان بوو، بەڵام بێسوودبوو. چەكدارەكان كردیانینە ژوورێكەوە ودەرگایان لێداخستین.

ژووریٚ تاریك، هەستمان لای ژن و منداڵەكان بوو، كە دەیانبردن بۆ نێو مەركەزەكە.دەنگ نەما، حەپەسا بووین، باوەڕمان نەبوو ئەمە ڕاستییە، هەر وامدەزانی خەونە.ژوورەكە هێند تاریكبوو، یەكدیمان باش نەدەبینی، چونكە ڕووناكیی تیا نەبوو، تەنیا پەنجەرەییٚ بچووكی لە بەرزی پێوە بوو.كەمێكی پێچوو بەرچاومان ڕووناك بووەوە، سپییەتی دیوارەكە، وەك لاپەڕەییٚ سپیی گەورە دەهاتە پێشچاو، چەندین یادگاریی لە سەر نووسرابوو، وتم دەبیٚ ئێمە هێند بمێنینەوە بەناچاری دیوارەكە بكەینە نووسینی یادەوەرییەكانمان؟ كەس وەڵامی نەبوو، بێدەنگ، لە گێژاوی خەیاڵدا بووین، هەستكردن بە تاوانباری دەیخواردینەوە، چۆن ئەو ژن و منداڵە ناسكانەمان بە دەستی خۆمان ئەنفالكرد، خوا دەزانیٚ

چییمان لێدەکەن، کێ دەڵێ بە بڕیارێ نامانبەنە بیابانەکە، وەك ئەنفالەکان زیندەبەچاڵ ناکرێین.

لەو مشتومڕ وبیرکردنەوانەدا بووین، دەنگێ زۆر لە دەرەوە دەهات، بێدەنگبووین، هەر چوارمان چووینە پێش دەرگاکە، هەستمان لە دەنگەکە ڕاگرت، تا بە تەواوی نزیکبوونەوە، دەنگی کردنەوەی دەرگاکە هات وکردیانەوە.

ئەفسەرەکە وچەکدارەکانی لەگەڵ لێپرسراوی مەرکەزەکەدا بوون کە پلەی نەقیب بوو.وتی گەورەم، ژمارەی ژن و منداڵەکان چواردەیە، پیاوان، چوار، هەموو دەکاتە هەژدە کەس.

نەقیب سەیرێکی کردین، رووی وەرگێڕا بۆلای ئەفسەرەکە، وتی: دەستتان خۆشبێ، پێویستە ئەم تاوانبارانە بە زووترین کات بدرێنە دادگا، باشترین سزا بدرێن.ویستمان قسە بکەین، هیچ ماوەی نەدا و وتی قسە مەکەن، گوێم لێتان نەبێ، فەرمانیدا دەرگامان لێدابخەن.

دەرگایان داخست، گوێمان لە نزیك دەرگاکەوە هەڵخست، بۆ ئەوەی بزانین چیی دەڵێن.بە ئەفسەرەکەی وت، خۆت و ئەو چەکدارانەی بەشداربوون لە ئەنجامدانی ئەم چالاکییە، سێ رۆژ مۆڵەتن، هەر ئێستە خۆتان ئامادەکەن تا مۆڵەتەکان واژۆ دەکەم.هەموویان سوپاسی نەقیبەکەیان کرد، هێند بە توندی سڵاوی سەربازییان بۆ دەکرد، دەنگی پێیان زەوییەکەی دەلەرانەوە.پێش ژوورەکەیان

چـۆڵکردین، زۆر بێهیـوا بـووین، وتم دەزانـن لـە "دەمـی گـورگ بەربووین، چووینە دەمی شێرەوە".

تەپەی پێیەکی زۆردەهات، بە پەلە بە پێش ژوورەکە تێپەڕدەبوون، زۆردڵخۆشبوون، مۆڵـەتن و دەچنەوە نێو مـاڵ و منـداڵیان و باسـی پاڵەوانێتیی خۆیان دەکەن.

مەرکەزەکـە کشـومات، چـەند تـاریکیی ژوورەکـە زیـادی بکردایـە، هەستمان دەکرد دەچینە نێو قولایی شەوی تاریکەوە و پتر دڵمان بە خێزانەکانـەوە دەبوو. دیسـانەوە دەنگـی پـێ هـات، دەنگەکـە نزیکبووەوە لە دەرگای ژوورەکەمان، دەرگایان لێکردینەوە، گوتیان بە پەلە وەرنە دەرەوە. چووینە دەرەوەی ژوورەکە، دەیانوت خەمتان نەبێ، نەقیب ئیبراهیم کوردە و لێپرسراوی یەکەمی مەرکەزەکەیە، ئـەو فـەرمانی پێکـردووین بتانبەینـە نێـو خێزانـەکانتان. وەك دوو فریشـتە لـە ئاسمانـەوە هـاتبن و فریامانکـەون، وابـوون. سـەرمان سـووڕمابوو، نەمانـدەزانی راسـتە یـا راسـت نییـە، زۆر بـەڕێزەوە فەرموویان لێدەکردین تاچووینە ژووری خێزانەکانمان، منداڵـەکان بە ڕاکردن بەرەو پیرمانەوە هاتن، خۆیان لێئالاندین، ئێمـەش باوەشـی خۆشەویسـتیی باوکایـەتییمان بـۆ کردنـەوە، هێنـد پەرۆشـبووین، وامانـدەزانی لـە مێـژە لـە یەکـدی دووریـن، زۆر پەشـیمانبووم بەوشـێوەیە باوەشمـان بـۆ منداڵـەکان کـردەوە، ئەحمـەدمان لـە بـیر نەبوو، لـە نزیـك گەلاوێـژ دانیشـتبوو، پشـتی سـەری بە دیوارەکـەوە

نوساندبوو، تەنیا بە چاوەکانی دەیڕوانییە ئەو دیمەنە ، زانی من هەستم پێکرد، یەکسەر ڕووی لە گەلاوێژ کرد وتی ئێستە چۆنی؟

– هیچ باش نیم، بۆ (دانا)ت لە ئامێز نەگرت، کاتێ بەرەو ڕووت هات، بزانە ئەوان چۆن باوەشیان بۆ منداڵەکانیان کردبووەوە. تەزوویێ بە لەشمدا هات، زۆر پەشیمانبووم، بەلاَم چیی بکەین تەنیا ئومێدی منداڵەکان، لەم ساتەدا، ئامێزی دایك و باوکیانە.

ئەو شەوە بە فەرمانی نەقیب ، پاسەوانەکان زۆر خزمەتیان کردین، لە هێنانی خواردن وجێگەوبان، هەموو ڕاکشابووین، چونکە زۆر شەکەتوماندووی نێو لۆری و هەڵسوکەوتی نالەباری ئەو چەکدارانە بووین.شەوێ درەنگ، پۆلیسیێ، بە هێمنی دەرگاکەی کردەوە، من و ئەحمەد لەو کاتە بە ئاگا بووین، هەر لای دەرگاکەوە بانگیکردین، کە چووم وتی نەقیب ئیبراهیم دەڵێ پیاوەکان بێن بۆ ژوورەکەم.

زۆر شپرزە بووین، ترساین دیسان جیامان بکەنەوە، (وریا و فایەق)، نوستبوون، بانگم کردن، هەر چوارمان بە دڵەڕاوکێ و ترسەوە، کەوتینە دوای چەکدارەکە بەرەو ژووری نەقیب.چووینە ژوورەوە، بە چەکدارەکەی وت تۆ بڕۆ. ئێمەش لە شوێنی خۆمان وەستابووین، ئاخۆ دەبێ چییمان پێبڵێ، دەبێ بە جنێودان ڕیسوامان نەکا و نەمانکاتە ژووریێ تاریك تا ئازارمان بدەن، چونکە داروەدەستەی ڕژێم، زۆرجار لە نیوەشەودا ئازاری بەندکراوان دەدەن. تەماشایەکی کردین، بە زمانی کوردیی بادینی وتی فەرموو دانیشن. ژوورەکەی بە قەنەفە و پەردەی جوان و فێنککەرەوە

ڕازابـووەوە، ئـەوەی کـە زۆر سـەرنجی ڕاکێشـام، تەلـەفۆنی سـەر مێزەکەی بوو.

لە چاوەڕوانیی و گوێرایەڵی وشەیێ بووین، لە زاری بێتە دەر، جا ئەو وشەیە (شیرینە یا تاڵە)، نازانین.بە زەردەخەنەیێ پڕ لە شەرم و ڕێزەوە، وتی براکانم، داوای لێبووردن دەکەم، ئێوارە لێتان تووڕە بووم، دڵتان نەترسیێ، ئێوە برای منن، خێزانتان خوشکی منن، منداڵتان کوڕ و کچی خۆمن، چیی لە توانام بیێ هاوکاریتان دەکەم، لەبەر ئێوە سیێ ڕۆژ مۆڵەتم پێدان تا بتوانم سەربەستانە هاوکاریتان بکەم، گەر لە پێشچاو ئەمانە تووڕە بووم، دڵتان نەترسیێ، چونکە زۆر گلاون، چاوەڕوانیی هەڵەیەکن بیکەم، تا ڕاپۆرتم لە سەر بنووسن و بیگەیەننە سەروومانەوە، تەنیا بۆ ئافەرینیێ.بەردەوام بوو و وتی ئەو ئەفسەرەی ئێوەی گرت، زۆر کەسێکی پیسە، (نائیب زابت) بوو، بەڵام لە حیزبی بەعس پلەی ڕەفیق حیزبی بوو، بە بڕیاری سەدام بوونەتە (ئەفسەر)، لەو باوەڕەدام هەر ئەفسەریێ دیکە بوایە، بەرەڵای بکردنایە، پاشان وتی من کوردم و خەڵکی شاری (موسڵ)م، لەبەر ئەوەی زۆر پشتگیریی حیزبم نەدەکرد، گواستیانمەوە بۆ دوورترین

خاڵی سنوور، کە ئەم شارەیە و پێیدەڵێن (سەفوان).

دڵی خۆشکردین، دڵەڕاوکیێ و ترسی لە دڵودەروونمان ڕامالی.وتم : دەتوانین بەو تەلەفۆنە، پێوەندیی بە کەسوکارمانەوە بکەین.

– خۆم بە نیاز بووم بیڵێم، تەلەفۆنەکەی هێنایە پێشەوە .

ئەحمەد پەڕاوێ تەلەفۆنی لە گیرفانی دەرهێنا و ژمارەیەکی لێدا، چەندجارێ هەوڵیدا، دواجار وەریگرت و پێوەندیی بە (محەمەد)ی برایەوە کرد.هەموو بێدەنگبووین، گوێڕایەڵبووین.

– ( محەمەد گیان هەندەرانی چیی، ئێمە سنوور داشکراوین، کەوتووینەتە دەست ڕژێم و لە زیندانی شاری (سەفوان)ین، بە پەلە بە کەسوکاری خێزانەکانی دیکەش بڵێ تا بە هەموو لایێ هەوڵدەن بۆ ئازادکردنمان).کە ئەحمەد بە قوڕگی پڕ گریانەوە قسەی کرد زانیم براکەی پرسیاری دانا و گەلاوێژ ی کردوە.هەستام و بە پەلە لە دەستی وەرمگرت، ئەویش زۆر بە هێمنیی دایە دەستم، سەری خۆی داخست، حەزم نەدەکرد زۆر قسە بکەم، ڕاستەوخۆ وتم محمد گیان، خزم و کەسوکار تێگەیەنە، زوو بێن و فریامانکەون.

– به سەرچاو، بەڵام کاکەم بۆ نەیتوانی بەردەوام بێ لە قسە کردن هیچ نەبووە؟

وتم:دڵنیابە هیچ نەبووە، بەڵام لە شوێنی غەریبی دڵ ناسکدەبێت، هەر ئێستە بڕۆ هەواڵەکە بگەیەنە کەسوکارمان. خوا حافیزبوونم کرد و تەلەفۆنم داخست، زۆر سوپاسی (نەقیب ئیبراهیم)مان کرد.

زەنگی لێدا ، پاسەوانەکەی هاتە ژوورەوە، پێیوت ڕیزێ چامان بۆ بێنە.بێدەنگبووین، چونکە حەزمان لە چا کە هەبوو.

وریا : گەورەم، ئێمە لەو ڕێیە ئازارێ زۆرمان چەشت، چەند ڕۆژ بە پێ دەڕۆیشتین وهیچ ئاوەدانی نەبوو، تینویەتیی و برسیەتیی تەنگی پێهەڵچنین، لە هەمووی ناخۆشتر، کوڕێ تاقانەی ئەحمەد،

بە هۆی نەخۆشییەکی کوشندەوە گیانی لە دەستدا ، لەبەر بێتوانایی، بە ناچاری لەو بیابانە چاڵێکمان هەڵکەن و ناشتمان، هەر بە هۆی ئەو کارەساتەوە ئێستا دایکی منداڵەکە باری دەروونی ناهەموارە.

بە پەرۆشەوە وتی بە ڕاستتانە؟!ڕووی کردە ئەحمەد و وتی

هاوبەشی خەمتم و خوا سەبوریت بدا.ئەحمەد سوپاسی کرد ووتی بەڵێ ئەو کارەساتەمان بەسەرهات، گەر نەگەیشتینایە ئاوەدانی، زۆربەمان گیانمان لە دەست ئەدا.

پاسەوانەکە، لەو کاتە چاکانی هێنا ودابەشی کرد، دەسمانکرد بە چا تێکدان، بێدەنگ دانیشتبووین وجاری فڕێکمان لە چا کە دەدا.

نەقیب هەناسەیەکی هەڵکێشا، دەستی برد بۆ پاکەتی سەر مێزەکەی وتی داوای لێبوردندەکەم، جگەرەم پێشکەش نەکردوون.لە سەر کورسییەکەی هەستا، دەستی درێژ کرد بۆلای ئەحمەدەوە و چەرخەکەی بۆ داگیرسان، چەند هەوڵی دا نەهێڵێ، بەڵام ئەو جگەرەکەی بۆ داگیرسان و وتی فەرموو بیدەرە ئەوانی دیکە.گشت حەزمان بە کێشانی جگەرە و چا خواردنەوەکە بوو.

نەقیب وتی سبەینێ بەیانی ، ئیفادەتان وەردەگرم، من پرسیار دەکەم و مفەوەزێ دەینووسێ، دەمەوێ وەڵامتان یەکبێ، چونکە هەر گۆڕانکارییێ لە وەڵامەکان هەبێ، دادگا بەرانبەرتان هەڵوێستی باش نابێ.

سبەینێ ئەم پرسیارانە دەکەم و وەڵامم بدەنەوە ............

پرسیار/ خەڵکی کوێن؟

وەڵام/ شاری کەرکوك

پ: چەند خێزان بوون ؟

و: چوار خێزان.

پ/ ژمارەتان چەند بوو؟

و/ ١٩ کەس (٤ پیاو، ٤ ژن، ١١ منداڵ)، بەڵام منداڵێ ئەحمەد لەو ڕێیە گیانی سپارد.

پ/ بۆ بەرەو هەندەران چوون ؟

و/ لەبەر هەژاریی و نەداریی .

پ/ لەگەڵ کێ چوون بۆ هەندەران؟

و/ کوڕێ کورد کە ناوی (ڕێبوار)ە.

پ/ خەڵکی کوێیە؟

و/ خەڵکی شاری هەولێرە.

پ/ بە هۆی کێوە توانی بتانگەیەنێتە ئەو دەوڵەتە؟

و/ بە هۆی ماڵە بەدوەکان.

پ/ ماڵە بەدوەکان دەناسن؟

و/ نەخێر، چونکە ئێمە هەر کە گەیشتینە شاری سەماوە، پاسێ شلۆقی خراپیان هێنا، زۆر لە شار دووریان خستینەوە ، پاشان چەن کاتژمێرێ بە بیاباندا ڕۆیشتین، لەبەر تۆزی لمی بیابان هیچ شوێنێ دیار نەبوو، تا گەیشتینە دەوارێ ڕەش، لەوێشدا کە سەیری چوار دەوری خۆمان دەکرد ، هیچ ئاوەدانیێ نەبوو.

پ/ چۆن گەیشتنە سنوور و پەڕینەوە؟

و/ بە پیکابێ دەبڵ قەمەرە، گەیشتینە نزیک سنوور، خۆمانیش هێندێ بە پێ ڕۆیشتین تا گەیشتینە دوو زنجیرە گردۆڵکەی بەرزی سنووری نێوان هەر دوو وڵات، بڕیمان و چووینە سعودییەوە، خۆمان گەیاندە مەرکەزی سەربازیی سنوور، بە ناوی مەرکەز شوعەرا.

پ/ بۆ وەرنەگیران؟

و/ وتیان پێشوازیی نەماوە، مافی پەنابەریی بە کەس نادەین.

پ/ داواکاریتان چییە؟

و/ ئێمە لەبەر هەژاریی و نەداریی سەری خۆمان هەڵگرتووە، دەمانەوێ هاوکاریمان بکەن و ئازادمانکەن.

(پاش تەواوبوونی پرسیارەکان، جێگیرکردنی وەڵامەکان)، نەقیب وتی ئەم وەڵامانە، با ژن و منداڵەکانیش بیزانن، نەوەك پرسیاریان لێبکرێ، بەڵام واچاکە، گەر ژن و منداڵ پرسیاریان لێکرا، بێژن زمانی عارەبی نازانین، تەنیا زمانی خۆمان دەزانین، پاشان وتی زۆر ماندوون، ئێستە بچن پشوو بدەن.

زۆر سوپاسمان کرد .پاسەوانەکەی بانگکرد وچووینەوە ژووری خۆمان، ژنەکان بە ئاگا هاتبوون، لە چاوەڕوانییدا بوون.

باسەکەمان بۆ کردن، خۆشترین هەواڵ بوو بۆیان بە تایبەت پێوەندیی کردنمان بە (محمد) برای ئەحمەد.شەو تا درەنگ لە

دووبارەکردنەوەی وەڵامی پرسیارەکان بووین.فایەق باوێشکێکیدا و وتی ئێستە هەموو وەڵامەکان دەزانین، ئینجا با بنووین.
بەیانی زوو لەگەڵ لێدانی دەرگا بە ئاگاهاتین، هەرچەندە لێدانەکەی بە هێزنەبوو، بەڵام خۆم هەر لە چاوەڕوانیدا بووم تا بە زووترین کات ڕۆژبێ، کات و ساتەکانمان زوو تێپەڕبێ.
سێ پاسەوان خواردنیان بۆ هێناین، پاشان (٨)ی بەیانی پۆلیسێ هات و وتی تەنیا پیاوەکان بێن.
بێدڵەڕاوکێ و بێترس هەر چوارمان چووینە بەردەم ژوورەکەی وەستاین، یەکەم کەس فایەق چووە ژوورەوە، دوا کەس خۆم بووم، چوومە ژوورەوە و سلاّومکرد، نەقیب خۆی بە چەند پەڕەییێکی سەر مێزەکەیەوە خەریك کردبوو، وەڵامی نەدامەوە، مفەوەزەکەش بە لالوتێکەوە وەڵامی دامەوە.
نەقیب رووی تێکردم و بە تووڕەییەوە وتی ناوت چییە؟
– سامان بەکر.
هەستایە سەرپێ، چووە نزیك پەنجەرەکە و پشتی تێکردم، سەیری دەرەوەی دەکردو پرسیاری دەکرد، منیش وەڵامم دەدایەوە، مفەوەزەکە دەینووسی.ئاوڕی دایەوە و دوا پرسیاری لێکردم، زانی بە نمایشی، سەری لێشێوانووم، لەو کاتەی مفەوەزەکە سەری داخستبوو دەینووسی، زەردەخەنەیەکی بۆ کردم، دڵڕاوکێی نەهێشتم.زەنگێکی لێدا، پاسەوانەکە هات، وتی بیگەیەنە شوێنی خۆی.

گشت، دڵخۆشبووین کە نەقیب ئیبراهیم پشتمانە.دەرگا کراوە بوو بۆ ژن و منداڵەکان، بە بەندی نەدەچووین، فایەق لای پەنجەرەکە وەستابوو، خەیاڵ بردبوویەوە و تەماشای دەرەوەی دەکرد ، لە پڕ وتی کورە وەرن سەیرکەن!، ئەمە ئەو ڕۆژەیە لێی دەترساین، بە پەلە، هەموو چووینە لای پەنجەرەکە، چەندین پیکاب و لاندکرۆز لە پێش مەرکەزەکە وەستاون و کڵاو سوورەکانی ڕژێم بە پەلە دەهاتنە خوارەوە، دابەش دەبوون بە سەر چواردەوری مەرکەزەکە و سەربانەکان، نەقیب و چەکدارەکانی لە پێشوازیدا بوون، زۆر ترساین و ئەژنۆی شکاندین، پاش چەند خولەکێ، قەمەرەیێ دوا مۆدێل ، جام رەش، لە نزیکەوە وەستا، پاسەوانە تایبەتەکەی بە پەلە دەرگای دواوەی کردەوە، چاکەت و پانتۆڵ لەبەرێ دابەزی، سەرو سیما مامناوەند، نەقیب سڵاوی سەربازی بۆ کرد و پاشان تەوقەی لەگەڵ کرد، فەرمووی لێکرد بۆ نێو مەرکەزەکە، خۆی چووە لای چەپییەوە، ئەو کەمە خۆشییەی لە دڵمان بوو، باری کرد و نەما، وتمان ئەمانە بە تایبەت بۆلای ئێمە هاتوون، لەگەڵ خۆیان ڕاپێچمان دەکەن، نەقیبش بەرانبەر ئەمانە هیچی بۆ ناکرێ.

ترسێ تۆقێنەر باڵی کێشایە ژوورەکەمان، بێدەنگیکردبووین، لە نێو ژوورەکە هاتوچۆمان بوو، جاروبار لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەمان دەکرد، کڵاو سوورەکانمان دەبینی، یەکجاری ئەژنۆمان دەشکا.جاروبار دەچووینە نزیك دەرگاکە ، گوێڕایەڵ بووین بۆ هەر دەنگوباسێ، ئەو مەرکەزە زۆر شڵەژابوو، پۆلیسەکان شپرزە ببوون،

دەنگی پێیان وخێرایی ڕۆیشتنیان بە ڕێڕەوەکان، شپرزەییانی زیاتر دەردەخست.پاش نیوکاتژمێرێ دەرگایان لێکردینەوە، پۆلیسێ بوو وتی فایەق تۆفیق، کێیە؟ بێتە دەرەوە.فایەق تەواو ڕەنگی تێکچووبوو، وەڵامی بۆ نەدەدرایەوە، خەریك بوو بڵێ ناچم، وایدەزانی بە ویستی خۆیەتی.ئەحمەد وتی هیچ خۆت شپرزە مەکە و زۆر بە سادەیی وەڵام بدەرەوە، وەك وەڵامی ئیفادەکان.

کەوتە پێش پۆلیسەکانەوە.لە وەڵامدانەوەی فایەق، بێباکبووم، چونکە هێند وەڵامی پرسیارەکانمان گوتبووە و دووبارەمان کردبووەوە، بەڵام ترسم لە دڕندەیی ئەمانە بوو، کە هاتبوون.

زۆری پێچوو، کات نەدەڕۆیشت، ترس ودڵەڕاوکێ پەرێشانی کردین، منداڵەکان ڕووی گەش و ناسکیان بە بەرگێ لە ترس داپۆشرابوو، چاوە گەشەکانیان دەشاردەوە، دەستمان بە سەریان دەهێنا، قسەی خۆشمان بۆ دەکردن تا دڵودەروونی پاکوبێگەردیان ئارامبێتەوە، ئەوانیش باوەڕیان نەدەکرد بە ئاسانی لە پیاوانی ڕژێم ڕزگاربین. دەرگایان کردەوە و فایەق هاتە ژوورەوە، داوای کەسی دیکەیان نەکردین.لێی کۆبووینەوە وتمان فایەق قسە بکە، چیی بوو،چ پرسیارێکیان کرد؟ هەناسەیێ توندی هەڵکێشا، توندی هەناسە دانەوەکەیشی گوپەکانی ئاوسانبوو، چ ترس و خەمێکی هەبوو فرێی دایە دەرەوە، ئینجا وتی ئەمانە لە پایتەختەوە هاتوون، بە تایبەتی بۆ هەواڵی ئێمە نێردراون، ئێستێك بێدەنگبوو، هەموو گوێڕایەڵ بووین بۆ وشە بە وشە کە لە زاری فایەق بێتە

دەرەوە،  وشەکانی هێند بە نرخ بوون، سیوچوار چاو، سیوچوار گوێ، لە چاوەڕوانیی دەربڕینی وشەیەکیدا بووین.

بەردەوام بوو و وتی هەر پرسیاری ئیفادەکانیان لێکردم، بەڵام ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەم کەسەی هاتووە، یەکەمجارە مرۆڤی وا ببینم لە دارودەستەی ڕژێم، هێمن ، بە سۆز و بەزەیی،  چونکە دەیوت من هاتووم بتانبەم بۆ پایتەخت بۆ لێکۆڵینەوە، بەڵام خۆم بۆم دەرکەوت،  ئێوە جاسوس و پیاوخراپ نین، لەبەر هەژاریی سەری خۆتان هەڵگرتووە، جا بۆیە هیچ مەترسن،  هەوڵدەدەین بە زووترین کات ئازادتانکەین.کە نەقیب وتی  گەورەم  کەسی دیکەیان بانگکەین؟ وتی پێویست ناکات،  تێیانگەیشتم.

براینە، نابێ چاکەی نەقیب ئیبراهیم لە بیرکەین، زۆر پرسیار کە وەڵامم دەدایەوە، هاوکارم دەبوو لە وەڵامدانەوە و ڕوونکردنەوەی وەڵامەکان، ئەمە برایە و پشتمانە، نازانین چیی بۆ بکەین تا بتوانین چاکەی بدەینەوە.( قسەکانی فایەق،  هێوری کردینەوە).

ئەحمەد چووە لای پەنجەرەکەوە وتی وابزانم دەڕۆن، چونکە هەموو پاسەوانەکان، کەوتوونەتە جوڵە وبە وریاییەوە تەماشای دەوروبەری خۆیان دەکەن.هەر لەگەڵ قسە کردنەکەی ، کۆمەڵێ لە پاسەوانەکانی نێو مەرکەزەکە، بە ڕاکردن چوون بەرەو لای ئۆتۆمبیلەکان و میوانەکە لەگەڵ نەقیب ئیبراهیم دەرکەوت، چوون بەرەو لای قەمەرەی لێپرسراوەکە.دەرگایان بۆ کردەوە و ئەویش زۆر بە ڕووخۆشییەوە، تەوقەی لەگەڵ نەقیب کرد و سواربوو، نەقیب

سلاّوی سەربازی بۆ کرد، هەموو ئەو ناوەیان چۆڵکرد و مالاّوایيان کرد. نەقیب بە پەلە، زۆر بە دڵخۆشییەوە گەڕایەوە.

لێشاوی ترس یەخەی بەردایـن، چاوەڕوانیی هەواڵی تازەبووین.

پۆلیسەکان سینیێ پاقلاوە و سنوقێ ساردییان بۆ هێنایـن، کە لە میوانەکان مابووەوە، هەموو ئەو کەسانەی لە مەرکەزەکە بوون، ڕووخۆشوگەش دیاربوون، هەستمدەکرد، لەبەر ئێمە دڵیان خۆشە، کە بە ئاسانی ڕزگاربووین لەوانەی هاتبوون. دەرگایان لێکردینەوە.

نزیك عەسربوو، نەقیب ئیبراهیم، خودی خۆی هات بۆ ژوورەکەمان، چەند چەکدارێکی لەگەڵ بوو، هەموو هەستاینە سەرپێ، بە چاوی سۆز و بەزەییەوە ڕوانییە هەمووان، وتی فەرموو دانیشن. خوشك و برایان، بە زمانی عارەبیی باسی هۆی هاتنی میوانەکانی پایتەختتان بۆ دەکەم، تا پۆلیسەکانیش تێبگەن چیی دەڵێم.

ئەم میوانانەی پایتەخت بۆ هەواڵی ئێوە هاتبوون، چونکە هەواڵیان پێگەیشتبوو ئێوە جاسوس و پیاوخراپن، ئەوانەی سێ ڕۆژ مۆڵەتم پێدان، لێرەوە و ڕاستەوخۆ چووبوون بۆ پایتەخت، هەواڵەکەیان گەیاندبوو، نەوەکو من هیچ لایێ ئاگادار نەکەمەوە، چونکە کوردن ولە خۆمن، ئازادیانکەم. پێشئەوەی لەگەڵتان لێکۆڵینەوە بکرێ، لێپرسراوەکەم تێگەیاند، کە ئەمانە لەبەر هەژاریی ملیان ناوەتە بیابانەوە، جگە لەوەش منداڵێکیان گیانی سپارد ودایکی منداڵەکەش باری دەروونی تێکچووە، گەر نەگەیشتنایە ئاوەدانی، زۆربەیان لە تینویەتیی و برسیەتییدا دەمردن، ئایا دەبێ ئەمانە

سیخوڕی بکەن و پیاو خراپبن؟! کە ڕوون کردنەوەکەی گوێ لێبوو، سەریسوڕما وتی یەکیان بانگکەن ، منیش فایلەکانم خستە پێشی و وتم جەنابت یەکیان هەڵبژێرە، یەکەم فایلی هەڵبژارد، کە فایەق توفیق بوو.

پاش لێکۆڵینەوەکە، لێپرسراوەکە وتی بۆم دەرکەوت قسەکانت ڕاست ودروستن، بەڵام ئەوانەی هەواڵەکەیان گەیاندووە ناڕاست و ئاژاوەگێڕن. لە سەر لێپرسراوێتیی خۆی هەواڵەکەیانی بە درۆ خستەوە و واژۆی کرد کە سیخوڕ نین و هەژارن، وتیشی ئەم هەژارانە نابەم لەگەڵ خۆم، بەڵام داواکارم لەم مەرکەزە نەمێنن، چونکە ئەوانەی هەواڵەکەیان گەیاندووە، وتوویانە نەقیب ئیبراهیم کوردە، بەزەیی پێیاندێتەوە، چەندجارێ لە ڕاپۆرتەکە دووبارەیان کردووەتەوە، "بیانگوازنەوە مەرکەزێ دیکە"هەوڵمدا تا هەر لای خۆم بمێننەوە، بەڵام ئەو وتی وا چاکە لای خۆت نەبن بە ویستی خۆت، بۆ چ مەرکەزێ دەیاننێری، سەربەستی، جگە لەوەش، دەتوانی چاوت لێیانبێ و چییت ویست، منیش هاوکارتم.سوپاسم کرد و وتم فەرمایشتتان بە جێیە، بە زووترین کات جێبەجێ دەکرێ.ئێستە ئەوەی دەمەوێ بە ئێوەی ڕاگەیەنم "خۆتان ئامادەکەن، دەتاننێرم بۆ مەرکەزێ تر هەرلەم شارە، لێپرسراوی مەرکەزەکە، ناوی (عەلی)یە، زۆر هاوڕێمە، دڵنیابن، لە هەر شوێنێ بن هاوکارتانم.

وتم :زۆرمان پێناخۆشە لای جەنابی بە ڕێزت دەڕۆین، بەڵام چۆنی بە باشدەزانی، چییت پێوتراوە، جێبەجێی بکە .
ڕۆیشتەوە بۆ ژووری خۆی.پاش کاتژمێرێ، بانگکراین بۆ گۆڕەپانی مەرکەزەکە، سواری دوو ئۆتۆمبیل بووین بەرەو شوێنی تازە.
لەبەردەم مەرکەزەکە وەستاین، نووسراوەکەیان بردە ژوورەوە، پاش ماوەیێ ، مفەوەزێ کورتە باڵا، لاوازی دەموچاو ئاوڵاوی، ئەسمەر، هاتە دەرەوە.بە تووڕەییەوە وتی دابەزن، گشتمان بە دڵێ پڕ لە ئازارو خەمەوە دابەزین، ژماردینی، بە چەکدارەکانی وت ئێوە بڕۆن، ئەم تێکدەرانە لای ئێمەن، پێوەندییان بە ئێوەوە نەما.
ئەحمەد : ئێمە تێکدەرنین.
بە تووڕەییەوە وتی ئێوە منداڵی نێو بێشکەتان تێکدەرە، ئینجا ڕێزی خۆتانگرن و قسەی زیاد مەکەن.
چەکدارێك: ئەمانە مرۆڤی باشن، هەژارن، پێویستە ڕێزیان بگرین.
ڕووی کردە چەکدارەکە، بە گرژیی و تووڕەبوونەوە، وتی ئێوە بڕۆن، بە پاسەوانەکانی خۆیانی وت بیانبەنە گۆڕەپانی مەرکەزەکە و زۆر بە جوانی بیانپشکنن، ئینجا ژن و منداڵ بکەنە هۆڵێکەوە ، پیاوەکانیش بۆ هۆڵێکی دیکە.چەکدارەکان زۆریان پێناخۆشبوو، هەر بە پەلە گەڕانەوە، بەڵام لە سەیرکردنیان، بۆم دەرکەوت دەچن بە نەقیب ئیبراهیم دەڵێن، تا بە زوویی بێ و فریامانکەوێ.
لە دەرگایەکی گەورەوە، چووینە نێو مەرکەزەکە، لە گۆڕەپانی نێوەند مەرکەزەکە، وەستاین بۆ پشکنین، واماندەزانی تازە

گرتوویـانین. مفەوەزەکـە وتــی پیـاوان، منــداڵ، ژنــان، بــە جیـا بوەستن.

وتم :منداڵـەکان بـێ دایکیـان نـاتوانن، بـەڵام ئێمـەی پیـاوان جیـا دەبینەوە.

لە پشتەوە دارێکی پێمدا کێشا وتی تۆ ڕێمان بۆ دەکێشی؟

هەموو وتیان با جیابینەوە، منداڵەکان لـە نزیـك خۆمـان ڕیـز دەکـەین با تووشی کێشـە نەبین.لـەو کاتـە، ئەفسـەرێ دوو ئەستێرە، قەڵـەوی خڕە، ورگن، ئەسمەر، بۆ لامان دەهات.

مفەوەزەکە چوو بـەرەو پیرییـەوە، سـڵاوی سـەربازی بـۆ کـرد، نزیـك بـووەوە، بـە دەنگـە دانوسـاوەکەی وتــی مفـەوەز جـەربوع ژمارەیـان چەندە؟

– گـەورەم، ژمارەیـان (٤ پیـاو، ٤ ژن، ١٠ منـداڵ)، واتــە هــەژدە تێکدەر.

وتم :گەورەم ئێمە تێکدەرنین، ئەم مفەوەزە چەن جارێکە دەیڵێتەوە.

ئەفسەر : چەپبە، زبان درێژی مەکە، گەر تێکدەرنین لە باکورەوە کـێ ئێـوەی گەیانـدە ئێرە.جـەربوع لـە پشـتمانەوە وەسـتابوو، دارێکـی دیکەی پێمدا کێشا و وتی ئەمە زۆربلێیە، بە هەڕەشە کردنەوە وتی: دوایی چارت دەکەم، ئەمانە بە لێدانی کێبڵ نـەبێ، لـە زمـان درێـژی ناکەون.

ئەفسەر: بە پەلە بیانپشکنن و بیانکەنە هۆڵەکانەوە.

هـەموو ئەبڵـەق ببـووین، زۆر دەترسـاین، بـە تایبـەت لـە مفـەوەز جەربوع، کە بە ڕاستی ناوی بە خۆیەوە بوو.
گەلاوێژ لە ڕیزی ژنان چووە دەرەوەو بەرەو سێبەرەکە دەڕۆیشت.
جەربوع هاواری لێکرد، کە بگەڕێتەوە، بەڵام گەلاوێژ گوێی نەدایێ و لە سێبەرەکە دانیشت.جەربوع بە پاسەوانەکانی وت:
هەر بە قۆناغە تفەنگ بیهێننە ڕیزەوە، مەڵێن ئەمە ژنە و بەزەییتان پێیدا بێتەوە.
ئەحمەد ڕووی کردە ئەفسەرەکە وتی :گەورەم، با وازی لێبێنن، باری دەروونی باش نییە و زۆر خراپە.لەو کاتە ناسکە، نەقیب خۆی کرد بە مەرکەزەکـەدا، ئەفسـەرەکە بـە پاسـەوانەکانی وت لێیگـەڕێن بـا لەبەر سێبەرەکە بێ.
بەرەو پیریـی نـەقیب ئیـبراهیم چـوو، دەیـوت، هەلـە، هەلـە ب کاکـە ئیـبراهیم وسـلاوی سـەربازی بـۆ کـرد و یەکـدیان ماچـکرد.هەموو ئاوڕمان دابوەوە، دڵەڕاوکێ و ترسمان کەمبووەوە.دەستیان خستە نێـو دەسـتی یەکـدی و بـەرەو لامـان دەهـاتن، لەگـەڵ هـەر هـەنگاوێ، کۆمـەڵێ خـەمی دەڕەوانەوە.جـەربوع سـلاوی سـەربازی بـۆ کـرد، نـەقیب تەماشـایەکی جـەربوعی کـرد ودەسـتی بـۆ ئێمـە و بـۆلای گەلاوێژ درێژ کرد وتی ئەمانە تێکدەرن؟!
مـلازم عـەلی، چـرپانییە بنگـوێی نـەقیب و بـە جووتـە بـەرەو ژووری ملازم عەلی چوون.(جربوع)، وەك سەگ بە دوایانەوە بوو.
ڕووم کردە یەکێ لەو پۆلیسانەی کە لامان بوون، وتم :

مفەوەز جەربوع بۆ وا بەرانبەرمان خراپە؟

نەیدەوێرا وەڵامبداتەوە، بەڵام پۆلیسەکەی تەنیشتی وتی:

ئەم جەربوعە برایەکی لە باکوور، تێکدەرەکان کوشتوویانە، لەبەر ئەوە ئێوە بە دوژمن دەزانێ، بەڵام خەمتان نەبێ، نەقیب ئیبراهیم لەگەڵ ملازم عەلی یەکدیان زۆر خۆشدەوێ، چونکە شیعە و کورد یەکدیان خۆشدەوێ، (ملازم عەلی) یش شیعەیە، پۆلیسەکە ویستی شتی دیکە بدرکێنێ، بەڵام جەربوع گەڕایەوە، هەموو بێدەنگبووین، نەك لەبەر ئەوەی دەترساین، چونکە بە ڕاستی ترسمان نەمابوو.

بە تووڕەییەوە وتی:

ئەو شێتە بێننە ڕیزەوە. گەلاوێژ خۆی بێزار ببوو، هێواش هێواش بەرەو لامان دەهاتەوە.ئینجا وتی ژن و منداڵ ببەنە ئەم هۆڵە، پیاوانیش بۆ ئەو هۆڵەی بەرانبەریان.

ئەحمەد : پیاوی چاك بە، جیامان مەکەرەوە.

لەم مشتومڕەدا بووین، هەر دووکیان لە ژوورەکەوە دەرکەوتن و ڕوو لە ئێمە دەهاتن، کە نزیکبوونەوە، جەربوع سلاّوی بۆ کردنەوە وتی:

گەورەم، ژن و منداڵ، ئەو هۆڵەمان بۆ داناون و پیاوان ئەم هۆڵەی بەرانبەریان.

وتم :گەر بکرێ هەمووان پێکەوەبین، وەك لای جەنابی نەقیب . مفەوەزەکە بە قینێکەوە تەماشایەکی کردم، گەر نەقیب لەوێ نەبوایە، دارێکی پێمدا دەکێشایەوە.

ملازم عەلی: ئەم مەرکەزە شوێنی ژن و پیاوی جیاوازە، من باش لە مەبەستتان دەگەم، وێڕای ئەوەی دڵنیام لە پۆلیسەکانم کە هەڵە ناکەن، بەڵام ئێوەی پیاوان دەتوانن لە پەنجەرەی هۆڵەکەتانەوە، سەیری هۆڵی خێزانتان بکەن، هەر جاری یەکێکتان ببن بە پاسەوان، چونکە ئێوە ئابڕووتان زۆر خۆشدەوێ و پیرۆزەلاتان، لەبەر ڕێزی نەقیب ئیبراهیم ئەم ڕێیەتان پێئەدەم.

نەقیب سوپاسی کرد و ڕووی کردە ئێمە و وتی:

ملازم عەلی هەر وەك منە وبە هەموو شێوەیێ هاوکاریتان دەکات.

ڕووی کردە ملازم و وتی ئەم خزمانەم بە تۆ دەسپێرم.

جەربوع زۆری پێناخۆشبوو نەقیب "ڕیسەکەی کرد بە خوری".

ملازم نەقیبی بە ڕێکرد وبە پەلە گەڕایەوە وتی مفەوەز جەربوع.

وتی: بەڵێ گەورەم.

– ئەمانە دەچنە هۆڵەکانەوە، سەبارەت بە ژن و منداڵ، لە کاتژمێر(٢) دوای دەوامی فەرمی، دەرگایان لێدەکرێتەوە سەربەست دەبن. جەربوع: گەورەم لەم تێکدەرانە دڵنیای؟

تووڕە بوو، وتی:

جەربوع، ئەمانە هەژارو دیلن، دەتەوێ تۆڵەی براکەت لەم بێدەسەڵاتانە بکەیتەوە، گەر تۆ هێند پیاوی ئازا و تۆڵەستێنی، کاتێ فەرمانی گواستنەوەت بۆ باکوور دەرچوو، بچوویتایە و چەند تێکدەرێکت لە بری براکەت بکوشتایە، نەك چەندین ئەملاوئەولات

کرد، تا نەچوویت، دڵنیام ئەمانە کاری خراپ ناکەن، دەئێستە بیانکەنە نێو هۆڵەکانەوە با پشوو بدەن .
جەربوع ڕەنگی تێکچوو، دەمی تەتەڵەی دەکرد، وتی بەڵێ گەورەم، هەر ئێستە.
ئەو هۆڵە گەورانە، هیچ بەندکراوی دیکەی تێدا نەبوو، نەماندەزانی بۆچی، ئایا خەڵکی ئێرە، ئەوەندە ڕۆشنبیر و پێشکەوتوون؟ پاسەوانیمان دابەشکرد بە سەر هەرچوارمان، هەر یەکێ دوو کاتژمێری بەردەکەوت، (فایەق لە کاتژمێر٧ ، وریا لە٩، من لە ١١ ، ئەحمەد لە١ ی شەوەوە )نۆرەمان بوو.شەو خەومان نەبوو، چونکە جیاکرابووینەوە لە خێزانەکان، جێگۆڕیش ببووین.
ئەحمەد : دەزانن کوڕینە، کەسوکارمان زۆریان پێچوو، ئێمە تەنیا کاک ئیبراهیم دەناسین، ئەویش هێند چاکەی لەگەڵ کردووین، پێمان شەرمە بۆ تێلیفۆن کردن، پێیبلێینەوە.گەر (محمد)ی برام بهاتایە، لەم باشوورە هاوڕیێ زۆرچاکودەسڕۆم هەیە، دڵنیام دەتوانێ هاوکاریمان بکات لە ئازادبوونمان.
وریا: چۆنە وا هاوڕێت لەم باشوورە هەیە؟لەو کاتە فایەق بانگی وریای کرد و وتی وەرە نۆرەتە.
ئەحمەد :وریا گیان بڕۆ تا تووڕە نەبووە، کاتێ دیکە باستان بۆ دەکەم کە چۆن ئەم هاوڕێیەم لێرە پەیداکردووە.
یازدەی شەو بوو، نۆرەی پاسەوانیم هات، یارمەتیم لە ئەحمەد وەرگرت وتم بنوو، چونکە دوای من نۆرەتە.

لێیڕاکشا وتی ئای بۆ جگەرەیێ.
چوومە لای پەنجەرەکە وەستام، چاودێریم دەکرد، پاسەوانەکان کەوتبوونە گفتوگۆ، ڕوومەتم نوسان بە پەنجەرەکەوە و تەماشام دەکردن، جگەرەیان دەکێشا، سەیری لای ئەحمەدم کرد، دەستی نابووە ژێر سەری و خەیاڵ بردبوویەوە و پەرێشانبوو بۆجگەرە، بانگی پاسەوانەکانم کرد، یەکیان هات پێموتم جگەرەتان پێ هەیە؟ دوو جگەرەی دەرهێنا ویەکیانی داگیرسان ودایە دەستم و ئەوی دیکەی پێمدا و وتی ئەمیش وەرگرە.
سوپاسم کرد و بە پەلە چووم بۆلای ئەحمەد، جگەرەکەی بینی بە پەلە دەستی لە ژێر سەری دەرهێنا ودانیشت وتی سامان گیان ئەمە بۆ منە؟!
- ئەی بۆ کێیە، خۆ من جگەرم ناکێشم.
جگەرەکەم دایێ، بە پەلە چەند مژێکی لێدا، جگەرەکەی دیکەم پێشاندا، وتم، فەرموو ئەم جگەرەیەش بگرە، زۆر دڵی خۆشبوو، گەر (دانا)م بە زیندوویی بهێنایە بەردەستی، هەر ئەوەندە دڵخۆشە بوو.
نزیک نیوەشەو بوو، دەنگی پێی پۆلیسەکان بە توندی دەهات، سڵاوی سەربازیان دەکرد، هەستم لای دەنگەکە بوو، گوێم لە پەنجەرەکە نزیککردەوە، ڕوانیمە لای دەرگاکە، پۆلیسەکان لەگەڵ میوانەکە قسەیان دەکرد، پیاوێکی دشداشە سپیی لەبەر بوو، چوار شانە، زۆر قەڵەو ، هاتە نێو مەرکەزەکەوە، هەر هەنگاوێکی، چەند

هەنگاوێکی ئێمە دەبوو، دەستێکی لە گیرفانیدا بوو، بە بەردەم پەنجەرەکە تێپەڕبوو، بەرەو ژووری ئەفسەرەکە دەڕۆیشت، دیسانەوە دەنگی پێی پۆلیسەکان هات، ئەمجارەیان، نەقیب ئیبراهیم و ملازم دحام بوو، ئەوانیش هاتنە ژوورەوە و بە پەلە بە بەردەمی مندا تێپەڕ بوون، بەرەو ژووری ملازم عەلی دەڕۆیشتن، حەزمدەکرد بانگی نەقیب بکەم، شەرمم دەکرد، بەڵام ئەوەندەی هەبوو، دڵەڕاوکیێ و ترسی لێکەمکردمەوە، ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو، ملازم دحام بوو، دەبوایە سبەینێ بهاتایەوە، چونکە سێ ڕۆژ مۆڵەت بوو، کەچی هاتبووەوە.زەنگێ لە ژووری (ملازم عەلی)یەوە لێدرا، پۆلیسێ بە پەلە ڕایکرد بۆ ژوورەکە، ئەحمەد هەستا وتی ئەوە چییە؟

وتم لە ژووری ملازم عەلی کۆبوونەوە هەیە.

ئەحمەد هات، هەردووك لای پەنجەرەی هۆڵەکەدا وەستابووین، هەستمان ڕاگرتبوو، ئاخۆ بەم نزیکی نیوەشەوە، دەبێ بۆچیی کۆبووبنەوە.

پاش ماوەیەکی کەم، پۆلیسەکە لە ژووری (ملازم) هاتە دەرەوە، خەریك کردنەوەی دەرگای هۆڵەکەمان بوو، هەر دووکمان سەیری دەرگای هۆڵەکەمان دەکرد، کردییەوە و هاتە ژوورەوە وتی سامان بکر کێیە؟کەمێ شێرزەبووم، زانیم لێکۆڵینەوەیە، وتم منم فەرموو. پۆلیسەکە وتی لە ژووری ملازم عەلی کاریان پێتە.

لەگەڵ پۆلیسەکەدا چووم بۆ ژووری ملازم عەلی، بە دڵی لەرزۆکەوە چوومە ژوورەوە، دشداشە لەبەرەکە، لە شوێن (ملازم عەلی) دانیشتبوو، دەمانچەکەی لە سەر مێزەکە و لە پێش خۆی دانابوو، (هەردوو ملازمەکەونەقیب ئیبراهیم، لە سەر قەنەفەکان دانیشتبوون، بەوەدا زانیم دشداشە لەبەرەکە، لەوان پلەی بەرزترە.

سلاّوم کرد، وەلاّمیاندایەوە، دشداشە لەبەرەکە وتی (هەلە، هەلە بکاکات، هەلە برەبع کاکە ئیبراهیم)، هەموو پێکەنین، منیش وەك ئەوان پێکەنیم و وتم سوپاستان دەکەم.وتی لەو قەنەفەیەی لای خۆت دانیشە، بەرانبەری دانیشتم.

دەستی بە سمێڵیدا هێنا، سەیریٚ هەمووانی کرد وتی چەند پرسیارێکت لێدەکەم، دەمەویٚ بە ڕاستی وەلاّمدەیتەوە، نەخۆت تووشی سەرێشە بکە، نە ئێمە.

– دڵنیابە، بە ڕاستی وەلاّم ئەدەمەوە.

وتی: هۆی چوونتان بۆ ولاّتێکی ئیسلامی چیی بوو؟

– ئێمە لەبەر هەژاریی بۆ ئەو ولاّتە چووین.

– ئەو قاچاخچییانەی بردتانی، خەڵکی کوێن؟

– ڕێبواری قاچاخچیی، دانیشتووی شاری (هەولێر)ە.بەدوەکەش لە بیابانی شاری سەماوەیە.

– دەتوانین هەردووکیان دەسگیرکەین.

– ڕێبوار لە هەولێرە، سەبارەت بە ماڵە بەدوەکە، شارەزای ئەو بیابانە نیم، تا بیدۆزینەوە.

وتی: هەستت نەدەکرد، سەر بە حیزبە ئیسلامییەکان بن؟
وتم : گەورەم، هێند بێویژدانبوون، بە جوولەکە دەچوون.
هەموو پێکەنین، خۆمیش دەمویست، قسەی خۆش بدۆزمەوە و دووری بکەمەوە لە پرسیارکردن و تووڕەبوون.
لە سعودیە، کەستان جیا نەکرانەوە، تا بە جیا قسەتان لەگەڵ بکەن؟
– نەخێر گەورەم، هەموو هەرپێکەوە بووین.بێدەنگبوو، دەستی برد بۆ شوێن پێنووسی سەر مێزەکە، پێنووسێکی دەرهێنا و لە پارچە لاپەڕەیێ تێبینییەکانی دەنووسی.دەستی برد بۆ پاکەتەکەی بەردەستی و فەرمووی جگەرەی لە ئەفسەرەکان کرد، جگەرەیەکی داگیرساند، ئەمجارەیان ڕووی تێکردمەوە و وتی:
هیچ مەفرەزەتان تووش نەبوو، بە پارە هاوکاری کردبن.
– نەخێر. تووشی هیچ مەفرەزەیێ وا نەبووین.
– چۆن لە سنوور پەڕینەوە.
– تا پەڕینەوە زۆر ماندووبووین، چونکە دوو ساتری بەرز سنووری هەردوو وڵاتی جیاکردبوەوە.
وتی :سنووری نێوانمان چاڵە یا ساترە؟
وتم :ساتر بوو .
وتی: نەخێر چاڵە، ملازم دحام، زانی ڕووی پرسیاری دەکرێتێ یەکسەر وتی گەورەم تۆ ڕاستدەکەی، سنووری نێوانمان چاڵە، بەڵام لەو شوێنەی ئەمان پێیدا تێپەڕیبوون، ساترە.وەك تێبینی نووسی و ئینجا وتی:

چۆن توانیتان بیٚ قاچاخچیی بگەڕیٚنەوە؟

– ئەستیٚرەیەکمان کرد بە نیشان وبەرەو ڕووی ئەستیٚرەکە دەڕۆیشتین تا هەر بە دەوری خۆماندا نەخولیٚینەوە.

وتی ئافەرین، ئیٚوە چۆن ئەم شتانە دەزانن، سەرەڕای ئەوەی لە شاخ دەژین، ڕووی کردە نەقیب، وتی کاکە ئیبراهیم، دەزانی ئیٚوە زۆر زیرەکن؟.

نەقیب ئیبراهیم :بەلیٚ گەورەم، ئیٚمە زیرەکین.

ملازم دحام: گەورەم، ئەمانە لە گەڕانەوە، منداڵیٚکیان لیٚدەمریٚ گەر تووشی ئاوەدانی نەبووبایە، زۆربەیان دەمردن، بەلاٚم خۆیان و بەختییان تووشی ماڵیٚ بەدوو دەبن، پاشان، ماڵە بەدوەکە پیٚیڕاگەیاندین، ئیٚمەش ئەو دەڤەرەمان پشکنیی و دوٚزیماننەوە.

وتی :کیٚتان لیٚ مردووە.

وتم :گەورەم، منداڵیٚ تەمەن چوار ساڵ، دایکیشی بە هۆی لە دەسدانی منداڵەکەیەوە، باری دەروونی زۆر خراپە.مژیٚکی لە جگەرەکەیدا و بە پەرۆشەوە وتی چۆن، کوڕم بە ڕاستتە؟!

– بەلیٚ، منداڵی (ئەحمەد ئەمین)ە.

– تۆ بڕۆ، ئەو ئەحمەدەم بە پەلە بۆ بانگکەن.

ملازم عەلی: گەورەم، گەر بە ئەرك نەبیٚ، هەر لای خۆتەوە زەنگیٚ لیٚدە.لەگەڵ زەنگ لیٚدانەکە، پۆلیسەکە هاتە ژوورەوە، دشداشە لەبەر وتی ئەحمەد بانگبکە.لەگەڵ پۆلیسەکە چوومە دەرەوە.

نازه و چرۆ، له پەنجەرەی هۆڵەکەیانەوە، بانگیان کردم.یارمەتیم له پۆلیسەکە وەرگرت، وتی فەرموو، بەڵام کەمێ پەلە بکە.کە چوومە لای پەنجەرەکە، نازە وتی سامان بۆچی بانگیان کردن، چیی بووە؟.
وتم هیچ نییە، تەنیا لێکۆڵینەوە دەکەن، بچن بنوون، با نەزانن بە ئاگان، نەوەکو بانگتان بکەن، شەوتان شاد.
چوومەوە بۆ هۆڵەکەی خۆمان، ئەحمەد لەگەڵ پۆلیسەکە بۆ لێکۆڵینەوە چووبوو.لای پەنجەرەکە وەستام و چاوەڕوانیی ئەحمەد بووم، نیوکاتژمێرێ لە چاوەڕوانیی، ئینجا ئەحمەد هاتەوە.
وتم :پرسیاری چییان لێکردی؟.
– پرسیاری سادەیان لێکردم، بەڵام بۆ مەرگی (دانا) و نەخۆشبوونی گەلاوێژ، زۆریان پێناخۆشبوو.دەزانی دشداشە لەبەرەکە بەڕێوەبەری ئاسایشی ئەم شارەیە، پلەی (موقەدەمە)، ناوی (جەدوعە)، زۆر ڕێزی لێگرتم، وتی هاوبەشی خەمتین و ئینشەڵڵا هاوکاریتان دەکەین.
وتم : ئەو کەتەیە، بەڕێوەبەری ئاسایش بوو؟!
– بەڵێ، ملازم عەلی پێیناسانم ...لەم قسانە بووین دەنگیان دەهات، کە سەرنجماندا، ماڵاواییان لە ملازم عەلی کرد و ڕۆیشتن.
بەیانی هەر بە زوویی، لە دەنگی (جەربوع) بە ئاگا هاتین، خواردنیان بۆ هێنایین، پاشان، جەربوع وتی پیاوان با بێنە دەرەوە.
چووینە گۆڕەپانی مەرکەزەکە، جەربوع کەوتە وتار خوێندنەوە، وتی ئیمڕۆ، ئێوەی پیاوان دەگوازینەوە بۆ زیندانییەکی دیکە لە

شاری (زوبێر)، تایبەتە بە (نەهێشتنی تاوان)، تەنیا ژن و منداڵتان لێرە دەمێنن. زۆرمان پێناخۆشبوو، ئەویش حەزیدەکرد، هەواڵی ناخۆشمان پێڕاگەیەنێ.

وتم ناکرێ ئێمە لێرە بمێنینەوە؟

وتی ئێوە تاوانبارن، دەبێ سزای خۆتان وەرگرن.

ئەحمەد : دەمانەوێ لەگەڵ (ملازم عەلی) قسە بکەین.

زۆری پێناخۆشبوو، بە لووتێ بەرزەوە وتی قسەی من و ملازم عەلی هەر یەکە، ئەو بەیانی فەرمانی پێکردووم.

وریا : ئێمە نە دزین نە پیاو کوژ تا بماننێرن بۆ زیندانی نەهێشتنی تاوان.بە گاڵتە پێکردنەوە وتی: بۆ بە ئارەزووی تۆیە؟.

ژن ومنداڵ لە پەنجەرەکەوە سەیریان دەکردین فرمێسکیان دەڕشت.

پۆلیسێ هات و بە (جەربوع)ی وت(ملازم عەلی) دەڵێ، پیاوەکان بێن بۆ ژوورەکەم.زانی ملازم ، دەیەوێ هاوکارمان بێ، بە نا بەدڵییەوە وتی وەرن بۆ ژووری ملازم.هەر بە پەلە چووین.لە پێشمان هەستا و زۆر ڕێزی لێگرتین، فەرمووی دانیشتنی لێکردین، تەنیا (جەربوع) بە پێوە وەستابوو، تەماشای (جەربوع)ی کرد وتی تۆ فەرموو بڕۆ. ئەویش ڕەنگی تێکچوو بەم هەڵسوکەوتەی ملازم، بە توندیی سلاوی کرد، چووە دەرەوە.زۆر بە ڕێزەوە وتی شەوێ (موقەدەم جەدوع)، بەڕێوەبەری ئاسایشی ئەم شارەیە، فەرمانیدا، تەنیا پیاوان بنێرینە شارێ دیکە، چونکە ئەم شارە، بە بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان، بڕیاری (چەك دامالینی) لە سەرە، هەر

بەندکراوێ، لە یەك ڕۆژ پتر نابێ بمێنێتەوە لە بەندیخانەکان بە تایبەتیی لەو ڕۆژەوەی دوو بەندکراو لەم بەندیخانەیەوە ڕایانکرد.من و نەقیب ئیبراهیم، زۆرمان پێناخۆشبوو، زۆر هەوڵماندا تا توانیمان ژن و منداڵ بهێڵینەوە. ئەحمەد وتی سوپاستاندەکەین، بەڵام داواکارییەکم هەیە,گەر بکرێ، یەکێ لە ئێمەی پیاوان لای خێزانەکان بمێنێتەوە.

– ئەمە فەرمانی (موقەدەم جەدوع)ە، بەڵام هەر ئێستە تێلێفۆن بۆ نەقیب ئیبراهیم دەکەم، تا پێوەندیی بە (موقەدەم جەدوع)ەوە بکا، دەستی بۆ تێلێفۆنەکە برد و پێوەندیی لەگەڵ نەقیب دا کرد و پاشان هەموو لە چاوەڕوانیی نەقیب بووین.

زەنگی تێلێفۆن لێدرا، نەقیب ئیبراهیم بوو.ملازم عەلی بە نەقیب ئیبراهیمی وت دەستت خۆشبێ، ئەنجامدانی کار هەر لە خۆت دێ، زانیمان شتێکی باشیان بۆ ئەنجامداوین.

تێلێفۆنەکەی داخست گوتی براینە، نەقیب پێوەندیی بە (مقدم جەدوع)ەوە کردووە، لە سەرەتاوە ڕازی نەبووە، پاشان وتوویەتی، ئەو پیاوەی ناوی ئەحمەد بوو، بەسەرهاتەکەی زۆر کاری تێکردووم، با ئەو بمێنێتەوە خۆم کەفالەتی دەکەم.هەموو، زۆر سوپاسمان کردن.ئەویش وتی هەرچییێ بە ئێمە بکرێ، دەیکەینە سەرچاومان، حەزدەکەم لەبەر منداڵەکان تا دوای نیوەڕۆ بچنە نێو خێزانەکان پاشان، دەتانێرین.

زەنگی لێدا ، جەربوع) هات.ملازم وتی هەر چواریان بۆ هۆڵی ژن و منداڵەکانیان ببە، تا کاتژمێر ١ی پاشنیوەڕۆ، لەوێدا دەمێننەوە، پاشان، (ئەحمەد ئەمین) لە هۆڵی خێزانی دەمێنێتەوە و سیانیان دەبرێن بۆ (زوبێر).(ویستی قسە بکا).بێباکانە، بە تووڕەییەوە وتی: فەرمانیان بە سەردا کردووم جێبەجێیبکەم، منیش فەرمانت بە سەردا دەکەم، چییت پێدەڵێم وابکە.

زانی ملازم تووڕە بووە، وتی بەڵێ باشە، گەورەم.

چووینە هۆڵەکە و دیسانەوە، باوەشی سۆز و خۆشەویستییمان بە یەکدیدا کرد.ئەمجارەیان (سۆز)ی کچم، باوەشی لە ئەحمەدیشدا، دەستە خنجیلەکەی لە ملی کردبوو، زۆرم پێخۆشبوو، بەو منداڵییە، ئەو هەستە ناسکەی هەبوو، دڵی ئەحمەد هێورکاتەوە و مەیلی (دانا)ی بداتێ...وەك ئەوەی (دانا)ی لە ئامێزگرتبێ، گوشییە خۆی و چەند ماچێکی کرد.

بێدەنگیێ ڕووی لە هۆڵەکە کرد، خەیاڵ بردبووینییەوە، سەرنجی ئەحمەدمدا ، دەستێکی بە ڕیشە درێژ و ماش و برنجییەکەیدا هێنا، زۆربەی سپیی ببوو، ئەو ڕوو و دەموچاوەی یەکەمجار ئاشنای بووم، زۆر گۆڕابوو، ئەحمەدێ دیکە بوو.زانی تەماشای دەکەم، هەناسەیێ سەردی پڕ لە نائومێدیی هەڵکێشا، بە دەنگێ نەوی گوتی سامان، حەزدەکەم لەبەر سۆز تۆ بمێنیتەوە.وتم سۆز کچی تۆیە، زۆر تۆی خۆشدەوێ، تۆش برا گەورەی هەموو لایەکی.

فایەق بە تووڕەییەوە وتی:

نازانم، نازانم ئەم کەسوکارانەمان بۆ نەهاتن؟!
ئەوە سێ ڕۆژە تێلێفۆن کراوە، پێشینان ڕاستیان وتووە: "تێر ئاگای لە برسی نییە" .
ئەحمەد : ئێمە زۆردوورین، بە دوو ڕۆژ ئینجا ئەگەر بگەن، پاشان خۆ نابێ بە دەسبەتاڵی بێن، خۆ دەبێ کەمێ پارە بێنن.
وریا: بێپارە بێن هیچیان بۆ ناکرێ.
وتم : گەر پارە نەهێنن، نەهاتنیان باشترە.
لە نێو خێزانەکان ماینەوە ، تا نزیك کاتژمێر، ١ی پاش نیوەڕۆ.
هێند بە پەرۆشبوو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی گواستنەوەمان، بە زوویی خواردنی خواردبوو، لە گۆڕەپانەکە وەستا و بە دەنگی شقارتە، ژێر دانی پاك دەکردەوە و تەماشای دەکردین.
پۆلیسێ دەرگای هۆڵەکەی لێکردینەوە، وتی مفەوەزجەربوع لە گۆڕەپانەکە وەستاوە و دەڵێ، ئەو سێ کەسەی، بڕیاری گواستنەوەیان دەرچووە، بێنە دەرەوە.نەماندەزانی چۆن جێیانبێڵین، کە هەستاین، سۆز وڕۆز توند دەسیانگرتبووم، وتم کچەکانم، ئێمە دەڕۆین پاش تۆزێکی دیکە دێینەوە.ڕەنگی ئاڵ و جوانیان، زەرد ببوو، دەیانزانی دیسانەوە جیادەکرێینەوە.فایەق هەر پێنج منداڵەکەی لێی ئالأبوون ، وریا هەردوو منداڵەکەی لا نەمابوو، گەڕابوونەوە لای دایکیان.
جەربوع لە گۆڕەپانەکەوە هاواریکرد، درەنگیان پێچوو، بانگیان بکە.

گوتم فایەق پەلەکە، ئەویش چاوەکانی سڕییەوە، ڕوو لە دەرگای هۆڵەکە هات.ژن و منداڵ,بە تیلی چاوی گەش وئەشکاوی دەیانڕوانی، بە نابەدڵییەوە مالاواییان لێدەکردین.
دوو کەلەپچەی لە پشتێنی پانتۆڵەکەی دەرهێناو دەست من و وریای پێکەوە بەست و دەستەکانی فایەق، بە کەلەپچەیەکەوە، وتی دڵنیابن بۆ دۆزەخ دەتانبەین، تا بزانن تاوان چییە!!
ژن و منداڵ لە پەنجەرەکەوە هاواریان دەکرد، بە گریانەوە دەیانوت بۆ دەستیان دەبەستی، بۆچیی، بۆ کوێیان دەبەن؟!
جەربوع بە فیزێکەوە، زاڵبوونی خۆی پیشاندەداین.ڕووم تێکردن وتم بچن دانیشن، کارتان بە ئێمەوە نەبێ، ئەم پێی خۆشە لە ئازاربین، جەربوع وتی بە زمانی کوردیی قسە مەکە.
- زمانی خۆمانە و لەگەڵ یەکدێ بە زمانی خۆمان قسە دەکەین.
لەم مشتومڕەدا بووین، ملازم لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە و سەیری کاتژمێرەکەی دەستی کرد و ڕوو لە ئێمە هات.کە بینی دەسمان بەستراوە، وتی جەربوع، گەر قسەت پێدەڵێم، دەڵێی ملازم لەگەڵم باش نییە ، شەرم ناکەی دەسیانت بەستووە، نەخوازەلا، لە پێش چاوی ژن و منداڵیان.
- گەورەم من لەگەڵیان دەڕۆم، لە ڕێگە ڕابکەن هەرمن بەرپرس دەبم.
ملازم : دەتەوێ بیسەلمێنی ئەمانە جێی مەترسین، تووڕە بوو لە جەربوع و وتی کەلەپچەکان بکەوە.زۆری پێناخۆشبوو، شەرمەزاربوو، ڕەنگە ڕەش و ئاولاوییەکەی زەرد هەڵگەڕا، بە

دەستی لەرزۆکییەوە، کەلەپچەی لە دەست کردینەوە، نەیدەزانی چیی بکا و سەیری کویێ بکات ، حەزی دەکرد زەوی قوتی بدا و جاری دیکە ئەو دیمەنە نەبینێ.

پۆلیسەکان حەزیان بەو رەفتارە ناشیرینەی نەبوو، بە کردنەوەی کەلەپچەکانی دەستمان، خۆشحاڵییان پیشاندەداین.

گەر شەرمم نەکردایە، چەپڵەیەکم لێدەدا و ئەو دیمەنەم لەبەرچاوی جەربوع ناخۆشتر دەکرد.دوو پۆلیسی بانگکرد و وتی بە پیکابەکە بیانگەیەننە بەندیخانەی (نەهێشتنی تاوان) لە زوبێر ، بە (جەربوع) ی وت پێویست ناکا تۆ هەر بچی، خۆم بەرپرسم لە هەرچیێ ڕووبدا، کە دڵنیام ڕوونادات.

## بەندیخانەی نەهێشتنی تاوان

گەیشتینە نێو شاری زوبێر، خەڵکێ زۆر دەسووڕانەوە ، سیمای بێکاری پێیانەوە دیاربوو، هەژاریی باڵی کێشابووە ئەو شارە، وێڕای ئەوە خۆزگەم دەخواست، وەك ئەوان سەربەست بووینایە، وەك ئەو کەناسەی سەر شەقامەکانی پاك دەکردەوە و پیسییەکەی دەخستە نێو عاربانەییێك و پاڵی پێوە دەنا، ئازاد بووینایە، نەك وەك ئێستە، دیلین و بۆ بەندیخانەی (نەهێشتنی تاوان) دەمانبەن ، کە جێگەی دز و پیاوکوژە.هیچ کاتێ چاوەڕوان نەبووم، ڕۆژێ لە ڕۆژان چارەنووس بمگەیەنێ بەم شوێنە.
ڕووی کردە دەرگایێ گەورە بە ئۆتۆمبیلەکەوە، چووینە ژوورەوە. قەڵەوێکی ورگنی چوار شانە، چوارخەت لە سەر شانی بوو ، واتە، (سەرۆك عەریفان_رئیس عرفە)ە بوو، قۆڵی کردبوەوە، کێبڵێکی بە دەستەوە بوو، چەندین خاڵی لە سەر بازووی کوتیبوو، شەقاوەیی خۆی دەنواند.نووسراوەکەی لە پۆلیسەکان وەرگرت و بۆ ژووری لێپرسراوی برد، کە هاتەوە، پۆلیسێکی خۆی بانگکرد وتی باش بیانپشکنە، بە دوو پۆلیسەکەی وت ئێوە دەتوانن بڕۆن.

پۆلیسەکە پشکنینی، پاشان (س. ع) پرسیاری ناوی لێکردین، زانی کوردین، بە پۆلیسەکانی وت بیانبەن بۆ هۆڵی ژمارە سێ.لە شیش بەندی هۆڵەکانەوە، بەندییەکان سەیریان دەکردین، دەیانوت، بەخێر بێن (کاکات)، وەك ئەوەی لە نێوچەوانمان نووسرابێ کوردین. دەرگای هۆڵی ژمارە (۳)یان بۆ کردینەوە، بۆنێ زۆر قێزەون و پیس بە ڕووماندا هات، هۆڵەکە بچووك بوو، بەلاّم سێسەد تا چوارسەد کەسی تێدابوو، بەندکراوەکان ، تەنیا شۆرتێکیان لە پێکردبوو، نیشانەی کێبلْ و ئۆتوو بە جەستەیانەوە دیاربوو، خۆیانیش، چەندین خاڵیان لە وێنەی دووپشك و مار لە سەر سینگ و قۆڵیان کوتیبوو، چاودێری بەندکراوان کە ئەویش یەکێك بوو لەوان، زانی کوردین وغەریبین وتی بچنە نزیك سەراوەکە تا شوێنێکتان دەسکەوێ.

بەو ڕێچکەیەی نێوەندیی هۆڵەکە، چووینە نزیك سەراوەکە، شوێنێ یەك مەتریمان بۆ دابین بوو، بە وێنەی سێکوچکەیێ، هەرسێکمان دانیشتین، حەپەسابووین، هەر سەرنجی یەکدیمان دەدا، باوەڕمان نەدەکرد، کەوتووینەتە نێو ئەم دز و پیاو کوژانەوە.

دەوروبەرمان خێرهاتنیان لێدەکردین.یەکێ وتی کاکە ئێوە بۆ بەندکراون ، تاوانتان چییە؟فایەق چووە پێشەوە پێیوت ئێمە سنورداشکراوین، لە سنوور گرتوویانین.زۆر بە سادەیی وتی هیچ نییە، شەش ساڵێ بەندبوونتان بۆ دەردەچێ.ئەو قسەیە سەر ودڵی گرتین، تووشی خەمێ زۆرتری کردین.فایەق تف لە قوڕگی وشك بوو

وتی  بە ڕاستە؟!!وتی کاکە زۆر نییە، ئەم بەندکراوانەی دەیبینی، تا ئێستە فەرمانی دادگایی بۆ هەر کەسێ دەرچووبێ، گەر سێدارە نەبووبێ لە بیست ساڵ کەمتر نەبووە، چونکە تاوانەکان، دزی و پیاوکوژییە.

فایەق : هەموو لە سەر دزی و پیاوکوژی گیراون؟

– نابینی نیشانەی ئوتوو، کێبڵ بە لەشمانەوە، ئەوە هەموو ئازار و ئەشکەنجەدانە بۆ دانپیانان و سەپاندنی تاوانەکان، لەوانەیە هەبێ لەبەر ئازارو ئەشکەنجەدان، دانی بە تاوانێکدا نابێ کە نەیکردووە، یا داروودەستەی ئاسایش وپۆلیس بە زەبری پارە لە بری دەوڵەمەندێ، هەژارێکیان گرتبێ و تاوانەکەیان بە سەردا سەپانبێ، یا کەسێ هەژار، تاوانی دەوڵەمەنێکی کردوەتە ئەستۆی خۆی، تا بڕێ پارە بۆ بژێوی ژیانی خێزانەکەی مسۆگەر بکا.

فایەق : بۆ شتی وا هەیە؟!!

– بەڵێ هەیە، بەڵام زۆربەی ئەمانە خۆیان تاوانبارن.

بەسەرهاتی ئەم بەندیخانەیە، یەکجاری ژیانی ولاتی لە پێشچاو خستین، هەرچەندە لە ناوچەکانی خۆمان بەم شێوەیە نییە، بەڵام دەترسام ڕۆژێ بێ و لەمانیش خراپترمان بە سەربێ.

ئاوڕێکم دایەوە لە بەندیەکەی نزیکم و وتم تۆ تاوانت چییە؟زۆر بە سادەیی وتی دزی، بەڵام باوەڕ ناکەم دادگا فەرمانی سێدارەم بدا.

زانی ئەم باسانە لای ئێمە سادە نییە و سەرسوڕهێنەرە، بزەیێ گرتی، کەمێ بێدەنگ بوو، پاشان وتی کاکە گوێ بگرن، خەڵکی ئەم

ناوچەیە لەبەر هەژاریی و برسێتیی، هەر کارێ نابەجێ بکا بۆ بژێوی ژیانی، لێی ناگیرێ و لە نێو کۆمەڵی ئێرە بە چاوی سووك سەیر ناکرێن، تەنانەت ناتوانین ڕێ لە دایك ، خوشك، کچ و ژنمان بگرین، گەر بیەوێ لەش فرۆشی بکا بۆ بژێوی ژیان، هەندێجارخۆمان چاوپۆشییان لێدەکەین.

قسەکانی کاری لە خۆیشی کرد، (وا دیاربوو لە خێزانیدا ڕوویداوە، بە ناچاری چاوپۆشی کردووە)، بەردەوام بووەوە لە ئاخافتن، بە قورگێ پڕ لە گریان، دەنگێ لەرزۆکەوە وتی هەیە پارەدار دەدۆزێتەوە و لەش فرۆشی بە ژن و خوشکییەوە دەکا، نەیتوانی پتر بدوێ، سەری داخست.بەزەییم پێدا هاتەوە، زۆر کاری تێکردین.

وتم :وریا لای خۆمان زۆر باشترە لێرە، کۆمەڵگەی ئێرە شیرازەی تەواو تێکچووە، وێرانەیە.

عارەبەکە سەری هەڵبڕی، تەماشای کردین، زانی بەسەرهاتەکان کاری تێکردووین، دەستی برد، لە نێو گونییەکەی ژوور سەری دەبەیێ بچووك ئاوی دەرهێنا ودایە دەست فایەق، یەکسەر وەریگرت وکەمێکی خواردەوە، ئینجا دایە دەستی ئێمە، لەو ئاوە گەرم و سوێرەمان خواردەوە، سوپاسمان کرد.

هۆڵەکە زۆر گەرمبوو، شەرممان دەکرد وەك ئەوان خۆمان ڕووت کەینەوە.هەمیشە لای (سەراو)ەکە، جەنجاڵبوو، بۆنی پیسی و پیسایی کاس و وڕی کردبووین، هەر کەسێ لە سەراوەکەوە

دەردەچوو، ئەو دەبە بچوکە سپییەی کە لە بری مەسینە بردبووی، گەر کەمێ ئاوی لە ژێر بمایەتەوە، سەد کەس دەستی بۆ دەبرد، ئەویش، جاری وا هەبوو بەزەیی دەهاتەوە و دەیدا بە دەست یەکێ، ئەو کەسە بە تامەزرۆوە بینی پێوە دەنا و دەیخواردەوە.

زۆر ترسام رۆژێ بێ وبە ناچاری دەسبەرین بۆ دەبەکانی سەراو!!.

دەرگایان کردەوە، قازانێ گەورە چێشتیان هێنایە ژوورەوە ، هەر یەکە و قاپی خۆی هەڵدەگرت وزۆر بە هێمنیی و بەرێزەوە دەچووە ریزەوە بۆ وەرگرتنی بەشە خواردنەکەی، سەرمسوڕمابوو، ئەمانە دزو پیاوکوژن، کەچی هێند بەرێز و هێمن بوون.

هیچ کەس ئاوڕی لێنەدراینەوە تا بتوانین خواردن وەرگرین، هەموو چاوبرسیبوون، هەر خۆیان لە بیربوو، تەماشای لای جەنجاڵییەکەمان کرد، چاودێرەکە بانگیکردین، فایەق بە پەلە هەستا و چوو بۆلای چاودێرەکە، ئەویش، قاپەکەی خۆی پڕکرد لە چێشت، لەگەڵ سێ سەموون، دایە دەست فایەق، خواردنەکە سڵقاو بوو، بەڵام تەنیا سڵق بوو، لەگەڵ ئاوی گەرم.

شەو هات، کاتژمێر (٩)ی تەواو، چاودێرەکە سوندەیەکی بە دەستەوە بوو، دووجار دایە سەرڕانی وتی تا سێ دەژمێرم، کە گەیشتە ژمارە سێ، کەس بە دانیشتنەوە نەما ، تەنیا هەرسێکمان نەبێ، هەموو لە سەر تەنیشت پاڵکەوتن، خۆیان چەمانبووەوە لە شێوەی هێمای پرسیار، تەواو چووبوونە کۆشی یەکدییەوە، چونکە

جێگە نەدەبووەوە، هاواری کرد بۆ ئەوانەی نزیکمان، کە جێگەمان بکەنەوە، ئێمەش چووینە ڕیزەوە وپاڵمان دایەوە.
بۆنی هۆڵەکە، مێشکی پڕکردبووین و نەمدەتوانی بنووم، نابوایە پێت بە ئارەزووی خۆت ڕابکێشایە، چونکە دەکەوتە سەر ئەوەی خوارتەوە.پرخەپرخیان خەوی زڕانم، پرخەی (فایەق) کێبڕکێیبوو لەگەڵ پرخەیان.وریا زانی نەنوستووم، وتی سامان نەنوستوی؟
وتم: نوســتنی چــیی!جــەربوع ڕاســتیکرد، دەیــوت بــۆ دۆزەخ دەتانێرین. وریا :ئێرە هێند ناخۆشە، خێزانی لە بیر بردووینەتەوە.
وتم :با هەوڵدەین بنووین، تا چاودێرەکە هاواری لێنەکردووین.
شەو درەنگی کردبوو، خەواڵو ببووم، گرانییێ لە سەر شانم بوو و بە ئاگای هێنام، پێییێ زلی ڕەشی قلیشاوی بوو، بە دڵێکی پڕ لە قینەوە، پێیەکەم لە سەر شانم لابرد و فڕێمدا تا خاوەنی بە ئاگا بێتەوە. ویستم ئەمجارەیان چاو لێکنێم و نەیکەمەوە، بەڵام لەشم کەوتە خوران، ئەسپێ، بووە میوانی پێست و خوێنم، دەیگەزیم و خوێنی لەشی دەمژیم، ئەو شەوە نەك خەوتن تەنانەت نیوکاتژمێرێ خەواڵو نەبووین.
بەیانی زوو، چاودێرەکە وتی یەك، دوو کە گەیشتە ژمارە سێ ، هەموو ڕاستبوونەوە ودانیشتن، کەسێ هەڵنەسایە، یا درەنگی پێچوایە، بە سۆندەکەی دەستی لێیدەدا، کە هەستامە سەرپێ، زۆر بە ئازارەوە چۆکم ڕاستبووەوە، دەسمکرد بە وەرزشکردن، وتم ئێوە لەگەڵ ئازاری لەشتان چۆنن؟وریا وتی زۆرخراپ، گەر وا بڕوا

لەشمان تەواو تێکدەشکێ.فایەق وتی ئەمشەو من هیچ نەنووستم.
وتم فایەق تۆ باشبووی پرخەت دەهات، بەڵام من و وریا هیچ نەنوستین.

بەو بەیانی زووە، قازانێ پڕ لە چا و سەمونیان بۆ هێناین، دیسانەوە چاودێرەکە فریامان کەوت، هەستت بە شیرینی چاکە نەدەکرد، جگە لەوەش زۆر ڕوون بوو.

ئەو بەیانییە، بەندکراوان جلوبەرگیان لەبەرکرد، ئاوێنەیان دەرهێنابوو، مووی دەموچاویان هەڵدەکێشا، خۆیان جوان وپۆشتە دەکرد، چونکە ڕۆژی (سەردان)ی بوو.

وریا : دەبێ ئەوڕۆ نەیەن تا لێرە رزگارمانکەن؟

پۆلیسێ پارچە پەڕاوێکی دایە دەست چاودێرەکە.

چاودێر: هەموو گوێ بگرن، یەکجار ناو دەخوێنمەوە.

هەر کەسێ ناوی دەخوێنرایەوە، بە پەلە دەچووە لای دەرگاکە و لە شیش بەندەکانەوە، ماوەی پێنج خولەك لەگەڵ کەسوکاری قسەی دەکرد.تا دوا لیستی سەردانی خوێنرایەوە گوێڕایەڵبووین، بەڵام نائومێدبووین.

سەردانی تەواو، ئەو کەلوپەل وخواردنانەی بۆیان هێنابوون، ناوی زیندانییەکەی لە سەر نوسرابوو، چاودێرەکە دەیخوێنەوە، ئەوانیش لێیوەردەگرتن. خەڵکەکە زۆرچاوبرسیبوون، خواردنەکانیان لە نێو پریاسکەیێ کۆدەکردەوە وحەشاریاندەدا،

بیریان لە تێکچوون و بۆگەنبوونی نەدەکردەوە، ناهەقیان نەبوو، چونکە دەبوایە ئەوەی بۆی هاتووە تا هەفتەیێ بەشیکردایە.
وشەی فەرموویان نەبوو، حەزیاندەکرد، سەردانیمان بهاتایە، نەك لەبەر ئەوەی بەزەییان پێماندێتەوە، بەڵکو، تا فەرموو هەر نەکەن.
ئەو عارەبەی ئاوی پێدااین، خورمای بۆ هێنااین، چاودێرەکەش میوەی بۆهێناین، بەڵام بە زۆر وەرماندەگرت، بە ڕاستی حەزمان بە وەرگرتنی نەبوو، بەڵام ناچاریان دەکردین.
ئەو ڕۆژە هەر لە خۆمەوە بێهیوا نەبووم، بە (وریا)م وت دڵنیابە ئەوڕۆ کەسوکارمان دێن.وریا وتی چۆن دەزانی؟وتم وا بۆ شەش ڕۆژ دەچێ هەواڵیان پێگەیشتووە، دەبێ ئەوڕۆ دەربکەون.
نزیك عەسر ، چاودێرەکە بانگیکردین، وتی سەردانیتان هاتووە.
بە پەلە ڕۆیشتینە لای دەرگای هۆڵەکە، بە پەرۆشەوە چاوم دەگێڕا "باوکی نازە، باوکی وریا، محمدی برای ئەحمەد و جوامێری برای فایەق" هاتبوون.گریان گرتبووینی، بەڵام خۆمان گرت بۆ ئەوەی لەبەر چاوی بەندکراوەکان نەگرین.محمد زانی زۆر بارودۆخمان نالەبارە وتی هاوڕێیێ خۆشەویستی ئەحمەد لێرەیە، بە نیازە هاوکاریمان بکات.باوکی نازە وتی بە ڕاستی ماڵی باشن، وێڕای ئەم گرانییەی ئەوڕۆ خەڵکی پێوەی دەناڵێنێ، ناهێڵن بچین بۆ ئوتێل، دەڵێن تا ئازادەبن، دەبێ ماڵی ئێمە بە ماڵ خۆتان بزانن.
وتم :ناوی خاوەن ماڵەکە چییە؟

- ناوی (ضیاء)ە، کاتی خۆی کاکەم لە مردن رزگاری کردبوو، هەر بەو هۆیەوە هاتوچۆمان بۆ ماڵی یەکدی هەیە، ئێستەش ئەو دەیەوێ پیاوەتی کاکەم بداتەوە.

وریا: ڕاستدەکەی، جارێکیان کاکەت ویستی باسی ئەو ماڵەمان بۆ بکا، بەڵام ماوەی نەبوو.

(س. ع) وتی کاکە، سەردانی تەواو.فایەق وتی هەرچۆنێکە، جارێ رزگارمانکەن لەم بەندیخانەیە، جگە لەوەی شوێنێ زۆر ناخۆشە. جێی دز و پیاوکوژە. جوامێر وتی هەوڵدەدەین.

چەند پریاسکەیێ خواردنیان بۆ هێنابووین، وەرمانگرت و ئیدی ئەوان ڕۆیشتن، فایەق تەماشای هەر سێ پریاسکەکەی کرد و وتی: زۆر باشە ، (لەفە ، خورما و میوە، سەموون)یان، بۆ هێناوین.وتم جارێ لەفەیێ بدەرە ئەو کوڕەی پشتمانەوە.

وتی نەکەن بڵێن بەشی ئەم چاوبرسییانەی لێبدەین.

وریا: پێم باشە بەشی چاودێرەکەش بدەین.فایەق تووڕەبوو، وتی کێ دەڵێ بەشی خۆمان دەکا.من و وریا وتمان لە بەشی ئێمە بیاندەرێ.

لەو کاتە یەکێ هات، بە (فایەق)ی وت کە سەموونێکی بداتێ، فایەق زۆر بە ڕاشکاوانە و بێشەرم وتی بڕۆ بابە بڕۆ، تا ئێستە لە کوێ بووی؟

وریا ویستی دەست بۆ پریاسکەکە ببات و دڵی عارەبەکە نەشکێ فایەق تووڕەبوو گوتی ئێوە پێوەندییتان بەم پریاسکانەوە نییە، هەر کاتێ برسیتان بوو، پێم بڵێن تا بەشتاندەم، باش؟

کابرای عارەب بە شەرمەزارییەوە گەڕایەوە.

فایەق دەستی خستە نێو پریاسکەی لەفەکانەوە و سێ لەفەی دەرهێنا، دەسمانکرد بە خواردنی، دەوروبەرمان تا دوا پارووی لەفەکە، سەیری دەمیان دەکردین، بە ڕاستی زۆر ناخۆشبوو، حەزمدەکرد بەشی هەموو بەندکراوەکانی بکردایە.

چاودێرەکە بانگی کردینەوە. فایەق وتی وریا بڕۆ، لەو باوەڕەدام جوامێر ئاوەکەی بۆ ناردبین، چونکە پێمگوت کە ئاوی ساردمان بۆ بێنێ.وریا ڕۆیشت، بە دەبەیێ ئاوەوە هاتەوە، ئاوێ زۆر ساردبوو، لەبەر ساردییەکەی هەستمان بە سوێرییەکەی نەدەکرد.

وتم فایەق گیان، چاوەکەم، لە میوەکە بۆ چاودێرەکە بنێرە و لەفەیەکیش بدەرە دەستی ئەم کوڕەی پشتمانەوە، با نەڵێن کورد چاوبرسییە و چاکەی لە چاو نییە.

زۆر بە نابەدڵییەوە لەفەیەکی دەرهێنا، دایە دەست کوڕەکەی پشتمانەوە، دوو پرتەقاڵی دایە دەست وریا، کە بیداتە چاودێرەکە. پاشان گوتی هیچی دیکە نەڵێن.

نزیك شەو بووینەوە، ناخۆشی نووستنەکەمان دڵی تەنگکردینەوە، چونکە خواردنی باشمان خواردبوو، زۆرگەرمامان بوو.(٩)ی شەو هات و دیسانەوە، وەك شەوی ڕابردوو پاڵماندایەوە، ئەمجارەیان

زووتر ئەسپێ بوو بە میوانمان، بە ڕاستی نەیدەهێشت بنووین.
بەیانی زوو هەستاین، گیانمان تێکشکابوو، لای دوو سەراوەکە زۆر جەنجاڵبوو، زۆربەی بەندییەکان نۆرەیان گرتبوو، چونکە خواردنی باشیان خواردبوو.فایەق وتی با بچین نۆرە بگرین و بچینە سەراو.
سەرەڕای ئەوەی زۆر پێویست بوو بچمە ڕیزەوە بۆ سەراو، بەلام شەرمم دەکرد، هەر لەبەر ئەوە من و وریا گوتمان ناتوانین بێین، شەرم دەکەین لە پێشچاو ئەمانە بچینە سەراو.فایەق گوتی شەرم هەیە، من وا سکم دەتەقێ.چووە ڕیزەوە، زۆری پێچوو تا نۆرەی هات، کە گەڕایەوە، گوتی ئەی ئێوە ناچن؟
وتم :گەر سکم لە ئازارا هەراسانم بکا، ناتوانم بچم.
– لەم شوێنانە دەبێ شەرم نەکەی، بۆ ئەوان شەرمناکەن.
وریا وتی ڕاهاتوون.فایەق وتی دەبێ ئێوەش ڕابێن. ڕاستیدەکرد، بەلام شەرمەکە بە سەرماندا زاڵببوو.
لەو هۆڵە زۆر بێزاربووین، شوێنی ئاژەلان لە شوێنی ئێمە خۆشتر بوو، بەلام چارنەبوو، تەنیا چارە، یا کەسوکارمان بە یەکجاری ئازادمانکەن، یا لەم گرتووخانەیە بمانگوازنەوە بۆ شوێنێ دیکە.
بەو بەیانییە، هێشتا خێروشەڕ بەش نەکراوە، لە هۆڵی ژمارە دوو، بوو بە شەڕو هەرا، (س. ع) و پۆلیسەکان، چوونە ژوورەوە بۆ لێدانیان، لە تاوانبار و بێتاوانی ئەو (شەڕەیان) دەدا، هۆڵەکەمان هێند بێدەنگبوو، گوێت لە هەناسە نەدەبوو، هەموو سەریان

داخستبوو، سەرمسوڕمابوو، لە هۆڵێ دیکە شەڕە، هۆڵەکەی ئێمە لە ترسان ئەبڵقبوونە!!

تەماشای دەرگای هۆڵەکەمان دەکرد، چاودێرەکە هێمای بۆ کردین، تا بە پەلە بگەینە لای، خۆمان گەیاندە لای چاودێرەکە.

– حەزدەکەم ئێستە ببینن چییان لێدەکەن، بەڵام بە تیلی چاو و زۆر بە ورياييەوە، وانەکەن بزانن ئێوە تەماشایان دەکەن.

ئەفسەرێکی قولە ڕەشی لچ ئەستوور، قژ لوولی چوارشانە، دارێ لە ژێر باڵیدابوو، لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە وەستا، دارەکەی لە ژێر باڵی لابرد، دەیدا بە ڕانی خۆیدا وسەرنجی هۆڵەکانی دەدا، یەکسەر سەرمان داخست، هاواری کرد وتی ئەو پاڵەوانانە کێن؟! بیانهێنن. سێ کەسیان بە شەق، بە لێدانی کێبڵ گەیاندە لای ئەفسەرەکە، پەلاماری پۆستاڵی ئەفسەرەکەیان دەدا، ئەویش بە دارەکەی دەستی کەوتە لێدانیان، بە شەق دەیدایە نێو دەمیان تا ماندوو بوو. پاشان وتی (س. ع)، هاشم بە پەلە فەلاقەیانکەن.

سێ بەندکراوەکە، هەر دەپاڕانەوە لە ئەفسەرەکە، دەگریان و دەیانگوت تۆبە ، تۆبە گەورەم، قوربانت دەبین وازمان لێبێنە.

ئەفسەر: بە سەرچاو، پاش فەلاقەکردن، وازتان لێدێنین.

نەمدەزانی فەلاقەکردن چییە، تەنیا ناویم بیستبوو.

یەکێ لە پۆلیسەکان دارێ درێژو پەتێکی هێنا، یەکێ لە تاوانبارەکانیان هێنایە نزیك ئەفسەرەکە وپاڵیان خست، هەر هاواری بوو، دوو پێییان لە قولەپێوە بە ناوەڕاست دارەکەوە

بەست، هەر پۆلیسێ، لایەکی دارەکەی گرت، هەردوو پێیان بەرزکردەوە و گوتیان گەورەم ئامادەین.

ئەفسەرەکە ڕووی کردە (س. ع) وتی دەسپێبکە.بە کێبڵەکە کەوتە لێدانی ژێر پێی بەندکراوەکە، هاواریدەکرد، تۆبە، جارێکی دی شەڕ ناکەم، لەگەڵ دەنگی شڵپەی لێدانی بە کێبڵەکە، چوارسەد کەسی هۆڵەکە ڕادەچڵەکین، بە دەم و دەستی پەلاماری پۆستاڵی ئەفسەرەکەیدەدا ماچی بکا تا وازی لێبێنن، بەڵام، تا خوێن لە ژێر پێی فیچقەی نەکرد، فرمێسک و لیك و ئارەقی تێکەڵ نەبوو و ڕەنگی مردووی لێنەنیشت و بێهۆش نەکەوت، وازیان لێنەهێنا. بەزەیی لەو مەرکەزە مالآوایی کردبوو، لە دڕندەترینی ئاژەڵی نێو دارستان، دڕندەتر بوون.پێیان لە دارەکە کردەوە و بە چوار دەسە دووریان خستەوە، دووەم بەندکراویان هێنا، لاڵ ببوو، وەك شێت پەلاماری پۆستاڵی ئەفسەرەکەی دەدا، ئەویش دەیوت ئەی ئێوە پاڵەوان نین؟!، بە تووڕەییەوە، بێبەزەییانە، وتی دەسپێبکەن. ئەمیشیان بە دەردی ئەوی دی و سێیەمیش بە دەردی ئەمانی دیکە برد.سێ لاشە لە گۆڕەپانەکە کەوتبوون، هۆشیان نەمابوو، ژێر پێیان سوور ببوو لە خوێن، ئەفسەرەکە گوتی بیانهێننەوە هۆشی خۆیان، ئەمانە درۆ دەکەن.(س. ع)، ناردی بۆ ئاو، بە یەك دەبە ئاو هەرسێکیانی هێنایەوە هۆشی خۆیان، ئەفسەرەکە وتی تۆبە دەکەن یا دووبارەی بکەینەوە؟ گوتیان قوربانتین گەورەم، گەر

دەنگمان لێوە هات، هێمن نەبووین، بمانکوژن، تەنیا ئەمجارە وازمان لێبێنن.
ئەفسەرەکە:(س. ع) هاشم، چەن کەس لە هۆڵی ژمارە دووە.گوتی گەورەم، بەم سیانەوە، پازدە کەس.وتی هەر پازدە کەسەکە، بکەنە هۆڵی ژمارە سێ، پازدە کەس لە هۆڵی ژمارە (سێ) وە بکەنە شوێنیان ئەمانیش، بە پێی خۆیان، دەبێ بڕۆن بۆ هۆڵی ژمارە سێ.
کە ڕووی کردە هۆڵەکەمان، بە پەلە سەرمان داخست، ئینجا گوتی بە زووترین کات فەرمانم جێبەجێبکەن.
(س.ع) سلاّوی سەربازانەی کرد وگوتی بەڵێ گەورەم.
ئەویش چووەوە بەرەو ژوورەکەی خۆی.
س. ع گوتی هەر سێکتان هەستنە سەر پێ، گوتیان گەورەم وازمان لێبێنە، بە دانیشتنەوە بە خشکەخشك دەڕۆین، چونکە ئازارمان زۆرە.وتی پەلە بکەن، گەرنا، هەر ئێستە فەلاقەتان دەسپێدەکەینەوە. ئەمانیش لە سەر لاپێیان، بە گەستنی زمان و لێویان لە ئازارا، هەستانە سەرپێ.پێیگوتن زوو بڕۆن بەرەو هۆڵی سێ.
بە ناچاری و بە ئازارێکی زۆرەوە، هاتنە هۆڵەکەمانەوە.هەر بە لێدانی کێبڵ، دوازدەکەی دیکەیان لە هۆڵی (دوو) هێنا. بێدەنگ ببووین، جوڵەمان نەدەکرد، س. ع وتی ئێستە پازدە کەس،

دەنێـرین بـۆ هـۆڵی دوو.لـەو کاتـە تـەنیا سـەرمان بـەرزکردەوە، ورتەمان لێوە نەدەهات.

دەستیکرد بە هەڵبـژاردنی بە تەمـەن ونەخۆشـەکان، لـە پـڕ گوتی کوردەکان لە کوێن؟هەر سێکمان بە پەلـە هەستاینە سەرپێ گوتی بڕۆن بۆ هۆڵی (٢).هـەر بە پەلـە خۆمـان ئامادە کـرد و چووین بـۆ هـۆڵی ژمـارە (٢)، لـە چـاو هـۆڵی ژمـارە سـێدا زۆر جیـاوازبوو، گەرچی ئەو هۆڵەش بچووك بوو، بەڵام کەمتر بووین، خـەوتنی تێدا باشتربوو. ئەو شەوەمان لەو هۆڵەدا بردە سـەر، لەگـەڵ بەندییـەکان ئاشـناییمان پەیـداکرد، تـا نیوەشـەو بـە سـەرهاتمان بـۆ یەکـدی دەگێڕایەوە، پاشان بە ویستی خۆمان نوستین.

بۆمـان دەرکـەوت ئـەوەی بـۆ هـۆڵی ٣ بنێـرن سـزادانێکی گەورەیـە، سەرەتا ئێمەیان وەك سزادان بۆ ئەو شوێنە نارد.

لـە نزیـك نیـوەڕۆ، بـاوکی وریـا ومحمـد هـاتن، زۆریـان پێخۆشـبوو ڕزگاربووینە لە هۆڵەکـەی دیکـە، بـەڵام هـەواڵێ ناخۆشـیان پێدایـن، کـە سـبەینێ بـە ژن و منداڵـەوە دەمانبـەن بـۆ (بەڕێوەبەرایـەتی ئاسایشی گشتی- مدیریـه الامـن العامـه) لـە شـاری بەسـرە، زانیـان هەواڵەکـە زۆر کـاری تێکـردین، محمـد وتـی خـەمتان نـەبێ، خزمـی هاوڕێکـەی (کاکـەم ئەحمـەد)، هـاوڕێی بەڕێوەبـەری ئاسـایش ودادوەری دادگاکەتانـە، پێویسـتە بچنـە ئاسایش، چونکە دەڵێن پێش دادگایی کردن، دەبێ نوسراوی ئاسایشی گشتی لەگـەڵ ئـەو مامەڵەیەدا بێ کە دەچێتە بەر دەستی دادوەر.

باوکی وریا: ئەورۆ دەتوانی بە پارە خەڵکی لە سێدارە ڕزگارکەی، ئێمەش لە سایەی خزموکەسوکارەوە، پارەیێ باشمان بۆ ئازادبوونتان هێناوە. (ئەوان مالاّواییان کرد و ڕۆیشتن).
دڵتەنگیمان پێوە دیاربوو، هەر بۆیە بەندکراوێ پرسی گوتی کاکە چیی بووە؟
وتم :بەیانی بۆ ئاسایش دەبرێین.
هیچی نەگوت، بێدەنگبوو. بەندییێ دیکە گوتی، هەوڵدەن بە پارە خۆتان لە ئاسایش رزگارکەن و نەچن، دڵنیابن، ئەم هۆڵە لە چاو ئەوێوە ئوتێل شیراتۆنە.
زۆر باسی ئازارو ناخۆشییەکانی ئاسایشیان بۆکردین، یەکێ لە بەندییەکان گوتی(من بەرگەی ئازارەکانم دەگرت، بە هیچ شێوەیێ دانم بە تاوانەکەم نەدەهێنا، بەلاّم ژنەکەیان هێنام و گوتیان گەر دان بە تاوانەکەت نەهێنی، لە پێشچاوت کاری خراپی لەگەڵ دەکەین، لە سەرەتاوە باوەڕم نەدەکرد و هەر سووربووم لە سەر بێتاوانیم، بەلاّم یەکێ لەو بێئابڕوانە، پەلاماریدا، ژنەکەم هاواری بۆ دەکردم، خۆم ڕادەپسکان تا ئەو کۆت و زنجیرەی پێوەی بەسترابووم، بپسێنم و ژنەکەم ڕزگارکەم، بەلاّم ئەو توانایەم نەبوونتەنیا پڕ بە گەرووم هاوارم دەکرد و جنێوم پێدەدان، لێکۆڵەر، گوتی دان بە تاوانەکەت دێنی، یا فەرماندەم ڕووتیکەنەوە، لە پێش چاوت کاری نەشیاوی لەگەڵ بکەن، بە ناچاری گوتم وازی لێبێنن، دان بە تاوانەکەم دەنێم.پاش

وەرگـرتنی زانیـاری تـەواو لـە بـارەی تاوانەکـەوە، بـە پێکـەنینی گاڵتەجارییەوە، پەلاماریان دایەوە، سەرم داخست، هاوارم دەکرد، بەڵام دوانیان گرتیان بە قژەکەم، بە زۆر سەریان بەرزدەکردمەوە، تا بیانبینم چ بێئابڕوویەکن)، نەیتوانی بەردەوامبێ لە گێڕانەوەی بە سـەرهاتەکەی، دای لـە کوڵپـەی گریـان، هـەمووان بـەزەییمان پێدەهاتـەوە، قـوڕگی ئێمەیشـی پڕکـرد لـە گریـان، نـەختێ هێـور بووەوە، گوتی، دڵنیام لە سێدارەش دەدرێم.

دەستم نایە سەر شانی، گوتم ئینشەلاَ وانابێ.

– هـیچ بـاکم نییـە، بـا لـە سـێدارە بـدرێم، سـەدامی خوێنمـژ و دارودەسـەکەی، ژیانیـان لـە پێشچـاو خسـتووین، بـەردەوامبوو و گوتی کاکە ئەمانە دڕندەن، زۆر هەوڵدەن با خێزانتان نەکەوێتە بەر دەستی ئەم دڕندانە.

ئەم بەسـەرهاتە زۆر ترسـاندینی، چـونکە هـەر سبەینێ بـە مـاڵ و منداڵەوە بۆ شوێنی ئەم بەسەرهاتە دەچین.

ئێـوارەی ئـەو ڕۆژە دیسـانەوە (بـاوکی وریـا و محمـد)، لەگـەڵ کەسێکی خـڕەی بـالاکورت، سمێڵ و سـەری تـەواو بۆیـە کردبوو، ڕەشـییەکەی بریقـەی دەهـات، زۆر پاکوخـاوێن و گورجوگـۆڵ بـوو، پێشئەوەی بگاتە لامان، لەگەڵ (س. ع)هاشـم، یەکدییان ماچکرد، ئینجا بەرەو هۆڵەکەمان هاتن، (محمد) پێیناساندین کە ناوی (ئەبو مونـا )یـە، دەسـڕۆیە لـە نێـو دارودەسـتەی ڕژێـم.زۆر قسـەی خۆشبوو، ورەمانی بەرزکردەوە، گوتی ئینشـەڵلا بە زووتـرین کـات

ڕزگاردەبن، سبەینێ دەتانبەین بۆ ئاسایش، دوای ئەوەی کە لە ئاسایش تەواو دەبین، دەچین بۆ دادگا.ئەمەی گوت و بە(س. ع) گوت چ ئەفسەرێ لە ژوورەوەیە.

وتی: رائد عومەر.

- زۆرچاکە، بابچین بۆلای.باوکی وریا، لەگەڵیان رۆیشت و محمد لای ئێمە مایەوە.لە بارەی (ئەبو مونا)وە، دەیگوت خزمی ماڵی (ضیاء)ی هاوڕێی (کاکەم ئەحمەد)ە، زۆر دەستی دەڕوا، ئەمشەو بانگێشتی بەڕێوەبەری ئاسایش و دادوەری کردووە، بۆ خواردن و خواردنەوە، تا سبەینێ کارەکان بە ئاسانی بڕوا.

لە ژووری ئەفسەرەکەوە هاتنە دەرەوە، ئەو ئەفسەرە زاڵمەی لەگەڵ سێبەری خۆیدا شەڕی دەکرد، دەستی لە نێو دەستی (ئەبو مونا) بوو، بە ڕوویەکی خۆشەوە بە ڕێی دەکرد.وڕەی بەرزکردینەوە، دەرکەوت ئەبو مونا دەستی دەڕوا.

هاتنەوە بۆلامان ئەبو مونا گوتی هیچ مەترسن، دڵنیابن سبەینێ بە ئاسانی قوتارتان دەکەم.

س. ع هاشم : کاکات، (ئەبو مونا) خەڵکی خۆشیدەوێ و بە مسۆگەریی دەتوانێ ئاسانکاریتان بۆ بکا.

ئەبو مونا سوپاسی کردو گوتی ئەمانە خزمی منن، هاوکارییان بکە.ماڵاوایيان لێکردين و ڕۆیشتن.

پاش ڕۆیشتنی ئەوان (س. ع) هات بۆ لامان و گوتی هەر چییتان دەوێ بڵێن، دەیخەمە سەر چاوان، چونکە ئێوە خزمی (ئەبو

مونا)ن. سوپاسمان کرد، ئەویش ڕۆیشت.یەکێ لە بەندکراوەکان گوتی دڵنیابن کارتان ئاسانبوو، چونکە واسیتەکەتان زۆر زیرەکە و قسەی لای لێپرسراوان گەڕانەوەی نییە، چونکە ئەم ئەبو (مونا)یە، باش دەناسم!!.گوتم چۆن دەیناسی؟گوتی ئەمە تەنیا ئیشی ئەوەیە، ببێ بە واسیتەی خەڵکی.

وریا: پلەی چییە وا دەسڕۆیە؟

– پلەی نییە، بەڵام پارەی باشدەدا بە لێپرسراوان، جگە لەوەش بانگێشتی بارەکانیان دەکا، بۆ ڕابواردن و بردنە سەری شەوانەیان. زۆرم پێناخۆشبوو کارمان کەوتووەتە دەست کەسێ وەك ئەبو مونا، بەڵام دەسەڵات نییە، دەمانەوێ ئازادبین وئابڕوومان نەکەوێتە دەستی ئەم دڕندانە.

ئەو شەوە خەوم نەبوو، تامەزرۆی ئەوە نەبووم، سبەینێ بەیانی منداڵەکانم دەبینم، چونکە حەزم نەدەکرد لەو شوێنانە بیانبینم، ڕەنگوڕوخساریان بێئومێدیی وترس داییۆشیبێ، ترپەی دڵی ناسکیان هەناسەی تەنگکردبن.سەرنجی ئەو بەندیەمەدەدا بەسەرهاتەکەی هاتەوە یادم، خستمیە نێو دەریای خەیاڵێ ناخۆش و ئاڵۆزەوە، بیر و هۆشم لای ئاسایش و ژن ومنداڵ بوو .

## بەرەو دەزگای ئەمنی بەسرە

لەگەڵ ئەوەی شەو خەومان نەبوو، بەڵام بەیانی زوو بە ئاگا هاتین، چاوەڕوانی چارەنووسێ ڕەشیی دیکە بووین، بەندکراوەکان بە چاوی بەزەییەوە سەیریان دەکردین، چونکە ئەو شوێنەیان بینیبوو، کوێیە و چۆنە!!.

لە پڕ (ئەبو مونا) و (محەمەد) هاتنە نێو مەرکەزەکەوە، هەر بە پەلە چوون بەرەو ژووری لێپرسراو، کەمێکی پێچوو، لەگەڵ (س. ع) هاشم هاتن ودەرگایان لێکردینەوە وچووینە دەرەوەی مەرکەزەکە. پاسێ گەورە، مۆدیلی زۆر کۆن، لەبەر دەرگا وەستابوو، سەرکەوتینە نێو پاسەکە، دیسانەوە ئامێزمان بۆ یەکدی کردەوە، چاو ودڵمان ڕوونبووەوە، چوار پۆلیس پاسەوان بوون لە نێو پاسەکە، دانیشتبوون و لۆژیاندادابوو.

لاندکرۆزی ئەبو مونا، لەوبەری شەقامەکەوە بوو، کەسوکاری تێدا بوون، ئەبو مونا بە شوفێری پاسەکەی گوت تۆ بڕۆ ئێمە بە دواتەوەین.هەر یەکەو لای خێزانییەوە دانیشتبووین، هەموو هەر دەپاڕاینەوە کە خوا بمانپارێزێ، کە گونیەیێ سەمون و خورمام

بینی، داچڵەکیم، ترسام لەوەی دەچینە ژوورەوە زۆرمان پێدەچێ.
لاندکرۆزەکە، بۆ دڵنەوایی، جاروبار دەکەوتە تەنیشتمان.
نزیك دەرگای ئاسایش بووینەوە، وەستاین، تەلاری مەترسیدار بوو
دیوارەکانیش سەروسیمای جەللادیان لێنیشتبوو.
دوو پۆلیسیان، بە نووسراوەکەوە دابەزین وبەرەو پرسگەی ئاسایش چوون.لە جامەکانەوە ملەقوتێمان بوو، ئەبومونا دیار نەبوو، لاندکرۆزەکەشی دوور ڕاگرتبوو، لە ناکاو بە پێ و بە پەلە بە تەنیشتماندا تێپەڕبوو، چووە نێو تەلاری ئاسایشەوە.
بە منداڵەکانم گوت ئێوە زۆر پاکن، نزا بکەن، لە خوا بپاڕێنەوە، تەنیا لێرە ڕزگاربین.لە سوچێکەوە، دەستە خنجیلەکانیان بەرزکردبوەوە، بە ئاسپایی و بە بێدەنگ، دەمیان دەجولانەوە، خۆزگەم دەخواست، ئەو وشە ناسکانەیان چییە و چۆن لە زاریان دێتە دەر، ئاخۆ دەبێ چیی بە خوا بڵێن وداواکارییان چیبێ!!
دەیانڕوانییە ئێمە، چۆن ڕەنگوڕوخسارمان بە نیگەرانی وترس داپۆشرابوو، دەترسان، پتر دەپاڕانەوە، ئێمەش چاوێکمان لای دەرگای ئاسایش، چاوێکمان لای هەستە ناسکەکانی منداڵەکان بوو، دەمویست خۆگربم، ورەی خۆم بەرزکەمەوە بتوانم دڵنەوایی ژن و منداڵەکان بکەم، بەڵام شوێنەکە هێند ترسناکبوو، زمان لە دڵنەوایکردن وەستابوو، ئەو درۆ گەورەیەی بۆ نەدەکرا، بڵێ (ئاسایش هیچ نییە!!).

پاش کاتژمێریٚ تەواو، ئەبو مونا دەرکەوت، دەمویست ڕوخساری بخوێنمەوە، ئاخۆ هەواڵی ناخۆشی پێیە یا خۆش.بە گورجیی، بە بیر و مێشکیٚ ئاڵۆزەوە، تێپەڕبوو، ئاوڕی لێنەدایەوە، چووەوە نێو لاندکرۆزەکەی.هەر دوو پۆلیسەکە لە دەرگای ئاسایشەوە دەرکەوتن، بە پەلە بوون، هاتنەوەیان نیمچە ڕاکردنیٚ بوو. نوسراوەکەیان بە دەستەوە بوو، تا گەیشتنە نێو پاسەکە، هەموو "ڕوحمان لە مشتمان بوو".هەر کە گەیشتنە نێو پاسەکە، شوفێرەکە گوتی دڵمان تەقی لە چاوەڕوانییا، چیی بوو؟!!

بە هۆی ماندووبوون وخۆشی هەواڵەکە، هەناسەیەکی خواردەوە، دەستی بە سینگییەوە گرت، ڕووی کردە ئێمە و بە هەناسە بڕکێوە گوتی مزگێنیی، بەڕێوەبەری ئاسایش، وەڵامی خۆی لە سەری نووسی و مۆری کرد وگوتی هەر ئێستە بیانبەن بۆ دادگا کارتان لێرە تەواو بووە.پۆلیسەکەی دیکە بە شوفێرەکەی گوت بە پەلە بسوڕێوە تا بە زوویی بگەینە دادگا، چونکە ئەبو مونا گوتی لای دادگا چاوەڕوانییتان دەکەم.

لە خۆشییان، فرمێسکی خۆشیمان دەباران.

فایەق ماچی پۆلیسەکەی کرد گوتی خۆشترین مژدەت پێداین، چ مژدانەیەك دەڵێیٚ ئامادەین.ماچی (فایەق)ی کرد، گوتی مژدانەمان ئازادبوونی ئێوەیە.هەمووان سوپاسمان کردن.

دەستم خستە سەر ملی سۆز و ڕۆز، ماچم کردن وگوتم نزای ئێوەی پاك وبێگەردبوو، کە بە ئاسانی لێرە ڕزگاربووین.

پۆلیسیّ هاته نزیکمەوه، پیرۆزبایی لیّکردم گوتی:
به ڕاستی خوا بەزەیی پیّتان هاتەوه، گەر بچوونایەته ژوورەوه، هەروا به ئاسانی ڕزگار نەدەبوون، زۆرئازاردەدران، هەمووتان به گۆجی دەردەچوون، نەخوازەلاّ، ژن و منداڵ!!بە دەنگیّ نەویتر گوتی (ویژدان، بەزەیی، مرۆیی لەو شویّنه هەڵگیراوه)، ژن، منداڵ و پیر ناپرسنەوه، چیی خوا پیّی ناخۆشه ئەم دڕندانه دەیکەن.
نزیك تەلاری دادگا وەستاین، لەبەر جەنجاڵی، کەس به کەسەوه نەبوو، ولاّتمان شڵەژابوو، هەژاریی و برسیّتیی، وای له خەڵکی کردبوو، بۆ پاروه نانیّ، ڕیّی خراپەکاری ولادانی زۆر نابەجیّ بگریّتەبەر، پیّشینان ڕاستیان گوتووه "برسیّتی ڕەگی هاری پیّوەیه" ئەنجامی خراپەکاریش، مرۆۋ تووشی زیندانی و بەرەو ڕووبوونەوەی دادگا دەکا.
زۆر به ئاسانی، ژن و منداڵەکانی گەیانده ژووری دادوەر، زۆری نەخایاند، هاتنەوه.ئەحمەد گوتی (ئەبو مونا)، چییت بۆکردین، مژدەمان دەریّ، گوتی دوایی هەموو شت دەزانن، ئیّستە ئیّوەی پیاوان وەرن.چووینه ژووری دادوەر، هەر چوارمان وەستاین، له سەر میّزەکەی خەریك نووسینبوو، تەوقی سەره کەچەڵەکەی بریقەی دەهات، ئەبو مونا چووه نزیکەوه، سەری هەڵبڕی، هیّند سووروسپیی، پاکوپوخت و جوانبوو، بەوه نەدەچوو لەم ولاّته ویّرانەیه بژی، کە دادوەرم بەو شیّوه بینی، دڵخۆشبووم، زانیم

بەرتیل خۆرە، لە سەر دەستی ئەم دادوەرە ئازادەبین، لەو باوەڕەم، چەندین بێتاوانی بە تاوانبار دادگایی کردبێ.

چەند پرسیارێکی لێکردین، ئەو پرسیارانە بوو، (نەقیب ئیبراهیم) لێیکردبووین، ترس ئەوەمان نەبوو هەڵە بکەین، چونکە هەموو وەڵامەکانمان لەبەربوو، زۆر بە ڕێزەوە فەرمووی لێکردین بچینە دەرەوە، تەنیا (ئەبو مونا) لای مایەوە، لە دەرەوە چاوەڕوانیی ئەنجامی دادگاییەکەمان بووین.

لەو کاتە (ضیا) هات، گوتی داوای لێبوردن دەکەم، هێندێ کاری بازرگانی سنوورمان هەبوو، بەڵام لەبەر ئێوە نەچووم، برادەرانم نارد وبە پەلە چووم بۆ ئاسایش گوتیان چوونە بۆ دادگا.پاشان گوتی ئەبو مونا لە کوێیە ، چیی کرد؟!!وتمان لای دادوەرە، ئێمەش لە چاوەڕوانیی ئەنجامی دادگاین.بە پەلە چوو بەرەو ژووری دادوەر، ئەمیش، یەکسەر چووە ژوورەوە. زۆریان پێنەچوو بە جووتە هاتنە دەرەوە.ئەبو مونا گوتی مزگێنیم دەوێ، باوکی وریا گوتی مزگێنیت سەرچاومان.

وتی:ژن و منداڵ هەر ئەوڕۆ ئازادەبن، بەڵام پیاوان دادگاییان تا پازدە ڕۆژ دواخرا، ئێستەش سواری پاسەکە بن وبچن بەرەو مەرکەز، تا ملازم عەلی فەرمانی دادوەر جێبەجێ بکات. چووینە (مەرکەز)ەکەوە، (جەربوع) دیار نەبوو، کە هەواڵەکەیان گەیاندە ملازم عەلی، بە پەلە هاتە دەرەوە.پیرۆزبایی لێکردین، واژۆی

نوسراوی ئازادبوونی ژن و منداڵەکانی کرد وگوتی خوا کەریمە بۆ ئێوەی پیاوان، دڵنیابن، (ئەبو مونا) ئێوەش ئازادەکا.
بــە فرمێســکی خۆشــیی، کردنــەوەی باوەشــی خۆشەویســتیی ماڵاواییمــان لــە ژن و منداڵــەکان کــرد، هــەموو ڕۆیشــتن، تــەنیا هەرچوارمان لەگەڵ ملازم و پۆلیسەکانی لە گۆڕەپانی مەرکەزەکە ماینەوە.
فایەق بە عەلی ئەفسەری وت :
حەزدەکەین تا ئازادەبین لای جەنابت بمێنینەوە، چونکە زۆرمان پێناخۆشە بچینەوە گرتووخانەکەی زوبێر.
وتی :گەر لە دەست من بووایە، بە چاوان، بەڵام ئاسایشی ئێرە ناهێڵن و قەدەغەیە.
وریا: گەر نەگەڕێینەوە زوبێر، ئیدی لە هەر شوێنێ دیکە بین، کێشە نییە.
ملازم عەلی: خەمتان نەبێ، ئەبو مونا دەتوانێ بتانگوازێتەوە بۆ شــوێنێکی دیکــە، ئەمشــەو لێــرە دەتانهێڵمــەوە، ســبەینێ لــە چاوەڕوانیی ئەبومونا دەبین.
سوپاسمانکردن وچووینە هۆڵەکەوە، دەرگایان لێداخستین.
(مفەوەز جەربوع) بە تیژی تێپەڕبوو بەرەو ژووری ملازم، پۆلیسێ لــە پەنجەرەکــەوە گوتی(جــەربوع) مۆڵــەت بــوو وئێســتە هاتــەوە، هەواڵی ئازادبوونی ژن و منداڵەکانی زۆر پێناخۆشبوو.دیسانەوە بە لای پەنجەرەی هۆڵەکەمان تێپەڕبوو، لە بری سڵاو و پیرۆزبایی،

مۆڕەی لێدەکردین.گوتم گوێ مەدەنێ، با هەر مۆڕەکا، هیچی لە دەست نایە، ئەحمەد، ئێستە دەبێ باسی (ضیا)مان بۆ بکەی، چۆن ناسیت، چۆن هاتوچۆ لە نێوانتان پەیدابوو؟

- جاری پێشوو وریا ئەم پرسیارەی لێکردم، ماوە نەبوو وەلأمدەمەوە، جا ئێستە گوێ بگرن، باسەکەتان بۆ بکەم.

ناسیاویم لەگەڵ ئەم (ضیا) ئە و لەم باشوورە دەگەڕێتەوە بۆ ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی کوردستان دژی ڕژێمی سەدام، لە بەهاری ساڵی ١٩٩١.

خۆتان دەزانن، کاتی ڕاپەڕینەکە، جەماوەری کوردستان لە دەروازەی ڕاپەڕینەوە، بست بە بستی خاکی کوردستانیان ئازادکرد تا گەیشتە شاری(کەرکوك)مان، کە دوا شاری کوردستانە و دوا ئامانجی ڕاپەڕینەکە بوو.ئەو شەوەی لە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان، ئاگاداریی و بانگەوازیی بۆ جەماوەری کەرکوکی خۆڕاگر ڕاگەیاند، "ئازادبوونتان نزیکە و ئاگری نەورۆز لە باباگوڕگوڕ دەکەینەوە" هەموو لە چاوەڕوانیی بووین، ماڵی ئێمە لەو ڕیزە ماڵە بووین، پێشمان (ڕەبیەکانی) ڕژێمی لێبوو، نیوە شەو بوو، لە پێش دەرگای دەرەوە وەستابووم، یەکێ بە جلوبەرگی سەربازییەوە بەرەو ڕووم دەهات، گومانم لێکرد پیاوخراپی ڕژێم بێ وئازارمدا، ویستم بچمە ژوورەوە، پتر هەنگاوی دەنا، هێمای بۆ کردم، نەڕۆمە ژوورەوە و چاوەڕوانبم، نزیکبووەوە، چەکێکی بە دەستەوە بوو، ترسام نیازی خراپبێ، ناچار وەستام تا گەیشت،

ئـەم ضـیائە بـوو، بـە دەنگـی پـڕ نائومێـدیی وتـی هـەواڵمان پێگەیشـتووە، ئەمشـەو هێرشـمـان بـۆ دەکـرێ، ڕەبیـەم جێهێشـت وڕامکرد، بەرەنگاری پێشمەرگە و جەماوەرم بۆ ناکرێ، سـەرەڕای ئەوەش خـۆم بـۆ کـێ بە کوشـتدەم، خـاوەن خێـزانم و مندالّم وردە، تکادەکەم هاوکاریم بکەی و لە ماڵەکەت بمشاریتەوە.

لە سەرەتاوە دوودڵ بووم، ئایا دەبێ فێڵ نـەبێ، بـەلاّم بـە گریانـەوە وتـی گـەر بکـوژرێم، کـەس نییـە مندالّـەکانم بـەخێو بکـا، تکـات لێدەکـەم، فریامکـەوە.زۆر بـەزەییم پیاهاتـەوە، بـێ دوودڵـی بردمـە ژوورەوە و بە پەلە دەرگام داخست، جلوبەرگی خۆم پـێ لەبەرکرد، لەو کاتە دایکم هات و گوتی کوڕم ئەوە چییە؟گوتم دایە گیان، هیچ نییە، ئەم سەربازە لە ترس کوشتن ڕووی لە مـاڵی ئێمـە کـردووە تـا بیشارینەوە و بیپارێزین، چونکە دەڵـێ ئەمشـەو هێـزی پێشـمەرگە دەگاتە کەرکوك، لـەو کاتـە (محمد) و (گەلاوێـژ) هەسـتان و گوتیـان ئـەوە چییە، چـیی بووە؟گـوتم ئـەم سـەربازە بەسـەزمانەیە، داوای هاوکاری دەکات، داڵدەیدەین.

ئەویش هەر سەیری دەمی دەکردین، ئاخۆ، چیی دەڵێین.جێگەمان بۆ ڕاخست، گوتم بنوو، هیچ مەترسە، ئێرە ماڵی خۆتە.

نزیك بەرەبەیان بوو، لە دەنگی (دۆشکە و ئاربیجی و کلاشنیکۆف) بە ئاگا هـاتین، ضـیا هەسـتابوو، دەلـەرزی، زۆر دەترسـا، بـە دەنگـە لەرزۆکەکەی دەیگوت کاکە، توخوا ئاشکرام نەکەن، گوتم دڵنیابە،

گەر (محمد)ی برام بدەمە دەستەوە، تۆ نادەمە دەسیان، تۆ ئێستە برای منی ویەکێکی لە ئەندامانی خێزانەکەمان.

بە پەلە چوومە سەربان، (رەبیەکان)یان دابووە بەر ئاربیجی، هاواری سەرباز و پاڕانەوەیان لە پێشمەرگەکان، تا نەیانکوژن دەنگی دەدایەوە، دڵخۆشبووم ئەم (ضیا)ئەم ڕزگارکرد و فریای کەوتم، چوومە خوارەوە گوتم رەبیەکانیان گرتووە، پێشمەرگە و جەماوەر کەوتوونەتە نێو شار، بە (محمد)م گوت تۆ لای (ضیا) بمێنەوە تا دێمەوە، گوتی کاکە حەزدەکەم منیش بێم، گوتم لەبەر (ضیا) نابێ بێی، من دەچم کە هاتمەوە تۆ بچۆ.

رووم کردە (ضیا) گوتم هیچ خەمت نەبێ، رەبیەکانتان نەما، رژێم ڕوخا، تۆش مەترسە، ئێرە ماڵی خۆتە، دەڕۆم و هەر بە زوویی دێمەوە، دڵنیا ببوو گوتی بە ئارەزووی خۆت.

چوومە دەرەوە، خۆشترین ڕۆژبوو، زۆربەی شوێنەکان لە ژێر دەسی خۆمانبوو، یەکەمجاربوو، پێشمەرگە ببینم وبە ویستی خۆیان لە نێو شار بسوڕێنەوە.تا سێ رۆژ (ضیا) لە ماڵ نەدەهاتە دەرەوە، لە چوارەمین ڕۆژ گوتی داواکارییەکم هەیە، (دەتوانی بمگەیەنییە گەراج تا بچمەوە بەرەو شاری بەسرە)؟

وتم بە سەرچاو، هەر کاتێ بڵێی، لاریم نییە.

بەهێمنی و بە شەرمەوە، گوتی:

بەڵام کاکە من یەك دینارم لە گیرفان نییە.

گوتم :گیرفانی من، گیرفانی تۆیە، هەر ئێستە ڕیشت بتاشە، تا گەرماوت بۆ ئامادە دەکەن، لە پاش نیوەڕۆ دەتگەیەنمە گەراج.
پاش نیوەڕۆ، چووین بۆ گەراج ، ئۆتۆمبیلی کەم لێبوو، زۆر ماینەوە لە گەراج، لە پڕ ئۆتۆمبیلێ هات، خۆی و بەختی، گوتی بەرەو باشوور دەچم.حەزدەکەم بۆ هاودەنگی چەند کەسێ هەڵگرم، گەر پارەش نەدەن گرفتێ نییە، بەڵام من پارەمدا و(ضیا) گەڕایەوە بەرەو باشوور.
جگەرەیەکی دەرهێنا و گوتی با ئەم جگەرەیە داگیرسێنم، ئێستێك بێدەنگبوو، مژێکی لە جگەرەکەیدا گوتی ئەم (ضیا)ئە بێوەفا نەبوو، کە زانی ڕژێم پەلاماری کوردستانیداوە، خەڵکی کوردستان کۆڕەویان کردووە بەرەو سنوورەکان،ماڵوسەروەتیان جێهێشتووە، خۆی گەیاندبووە ماڵمان, پارێزگاری لێکرد و نەیهێشتبوو هیچ کەس ماڵمان تاڵانبکات.
وریا: ئەی لە کۆڕەوەکە تا کوێ چوون؟
دوا مژی لە جگەرەکەیدا، چەقانییە زەویەکە و کوژانییەوە و گوتی ئەویش باس و بەسەرهات و لێقەوماویێ دیکەمە، هەناسەیێکی هەڵکێشا، زانیم کارەساتێ دڵتەزێنی دیکەی بینیوە، گوتی:
کۆڕەو، خەڵکانێ زۆری سەرگەردانکرد، چیرۆك و سەرگوزشتەی زۆری لێکەوتەوە، ئێمە، بەرەو سنووری ئێران ڕۆیشتین، هەموو کوردێ لە ڕۆژهەلات پێشوازییان لێدەکردین، زۆربەیان ژووری تایبەتییان ئامادەکردبوو بۆ فریاکەوتنمان، جگە لە

دەستەڵاتدارانی وڵاتیان، کە چەندین ئۆردوگایان کردبووەوە بۆ پێشوازی و فریاکەوتنی ئاوارەکان، ئەو کاتەش منداڵێکمان هەبوو، تەمەنی یەك ساڵ بوو، هەر ناوی (دانا) بوو، بە هۆی سەرما و سۆڵەی ڕێوبان تووشی سکچوون وڕشانەوە بوو، زۆریشمان مابوو بگەینە سنوور، لە ماڵی مەلای گوندێ ماینەوە، شەوێ درەنگ، بۆ دواجار چاوەکانی لێکنا، هەر لەو گوندە ناشتمان.

زۆرمان پێناخۆشبوو، برینەکەیمان کولانەوە کە هێشتا برینی ئەم (دانا) یەی سارێژ نەبووە، داوای لێبوردنمان لێکرد، ئەویش گوتی ئیدی ئەمە ژیانە، دەبێ خۆشیی وناخۆشیی تێدا ببینی، مرۆڤ نابێت بێ هیوا بێت، سەرەڕای ئەم بەسەرهاتانە، دەمانەوێ لە ژیان بەردەوامبین، من دوو(دانا)م لە دەستچوو، پاش ماوەیێ دیکە بیر لە (دانا)یێ دیکە دەکەمەوە، دەبێتە هیوایەکم، ئەو هیوایە بەردەوامی دەدا بە ژیانم.

فایەق: پاش ناشتنی دانا بۆ کوێ چوون؟

– چووین بۆ ئۆردوگاکان، تا لێبوردنی گشتی دەرچوو، ئەوسا گەڕاینەوە بۆ شارەکەمان، کە چووینەوە بۆ ماڵ، یەکەمین کەس ئەم (ضیا)ئەمان بینی، ببوو بە پاسەوانی ماڵەکەمان، ئەویش بەسەرهاتەکەم دەزانێ.

ئێستێك بێدەنگبووین، پاشان بە زەردەخەنەیێ( بە توانایی بەرانبەر ناخۆشییەکانی پێشانداین)، گوتی ئەوە بەسەرهاتەکەم بۆ باسکردن، ئەی ئێوە لە کۆڕەوەکە گەیشتنە کوێ؟

وتم :ئێمە لەو ڕێیە زۆر ماندووبووین، نەنکم تووشی نەخۆشی بوو، هەرجاری بە کۆڵی یەکێکمانەوە بوو، جگە لەوەش، تا گەیشتینە سنوورەکان باران لێینەدەکردەوە، چووینە ئۆردوگا، نەخۆشییەکەی درێژەی کێشا، زۆر بێهێزی کرد، گەیانمانە نەخۆشخانەی نێوشار، لەبەر کوشندەیی نەخۆشییەکەی، گیانی سپارد، ئێستەش گۆڕەکەی لە شاری (مهاباد)ە لە ڕۆژهەڵات.

ئەحمەد: ئیمڕۆ باسی کۆڕەوە، ڕووی کردە وریا گوتی ئێمە باسی خۆمان کرد، تۆش باسی خۆت بکە، پاشان نۆرەی فایەق دێ.

وریا: دەترسم باسەکە بکەم، فایەق تووڕەبێ.

– بۆ تووڕە دەبم، هەر ئێمە نەبووین شەڕمان بووبێ، چەندین کەسوکار لە یەکدی تووڕەدەبوون، برا لەگەڵ برا نەدەگونجا، خەڵکی چاوبرسیی بوون، دوو خێزان بڵێن پێکەوە چووبن، ئێستە گلەیی لە یەکدی نەکەن.

– وریا، قسەی فایەق ڕاستە و تووڕەش نابێ، هەرچیی هەیە باسی بکە.

– تا گەیشتینە سنوور و ئۆردوگاکان، ئەم (فایەق)ە چەندین جار شەڕی لەگەڵمان دەکرد، نەك هەر لەگەڵ ئێمە، لەگەڵ براکانیشی.

بەم باسانە گەیشتینە نزیك ڕۆژاوابوون. پۆلیسێ هات گوتی سەردانیتان هاتووە، (محمد) هاتە لای پەنجەرەی هۆڵەکە ، گوتمان خێزانەکان چیی دەکەن؟وتی مام مەحمودی باوکی نازەخان و جوامێر، بردیاننەوە.

ئەو ڕۆیشت و شەومان بەڕێکرد بە گێڕانەوەی بەسەرهات وسەرگوزشتەکانمان.

ڕۆژبووەوە، تا نزیك نیوەڕۆ لە چاوەڕوانیدا بووین، باوکی وریا و محمد و ئەبو مونا، تێپەڕبوون وچوون بەرەو ژووری ملازم عەلی زۆریان پێنەچوو لەگەڵ ملازم عەلی لە گۆڕەپانی مەرکەزەکەدا وەستان، پۆلیسێ دەرگای لێکردینەوە، کە بۆ لایان چووین، ملازم عەلی وتی نەمگوت ئەبو مونا دەتوانێ بتانگوازێتەوە، نوسراوێکی پیشاندایِن وتی بە پێی ئەم نوسراوە، ئێوە دەچن بۆ زیندانی بەسرە.

ماڵاواییمان لێکردن، تەنیا لە (مفەوەز جەربوع) نەبێ، لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە، تەماشای دەکردین و پیشی دەخواردەوە.

گەیشتینە مەرکەزی شاری بەسرە، لە دەرگایەکی گەراجی گەورەوە چووینە ژوورەوە، ئەم مەرکەزە تایبەت بوو بە (تەسفیرات)، واتە ئەوانەی تاوانبارن و دادگاییان کرابوو، لەوێوە دەناردرانە بەندیخانەی گشتیی، بۆ وەرگرتنی سزای دادگایی کردنەکانیان.

یەك ڕیز ژوور لە پاڵ یەکدی، هەر ژوورێ، دەرگای شیش بەند بوو. چووینە ژوورێکەوە، زۆر پاکبوو، جگە لە سەراو، گەرماویشی

تێدا بوو، ئاوی زۆر باشیان هەبوو، تەنیا مەگەر بە دەرگا شیش بەندییەکەی، هەستت بکردایە بەندیخانەیە، بەرانبەر ئەم ژوورانە، گۆڕەپانی مەرکەزەکە بوو، لەو بەر گۆڕەپانەکەوە، ژووری کارگێڕی ولێپرسـراوی مەرکەزەکـە بـوو، ژوورەکـەی ئێمـە، دوو گـەنجی تێدابوو، یەکیان ناوی (کەریم)، ئەوی دیکە (حوسێن)بوو، جێـی پـاك وپوختیـان لەمبەرولەوبـەری ژوورەکـە ڕاخسـتبوو، ئێمـە جێوبانمان لەلا نەبوو، کەشوهەواش گۆڕابوو، پێویستمان پێبـوو، هەر بە پەلە (محمد) چوو بۆ ماڵی (ضیا) و پێخەف بۆ هێناین.

کەریم: گەرماو هەیە، ئاوی زۆر باشی لێیە، بۆخۆتان ناشۆن؟

ئێمەش هەر جاری یەکێکمان خۆمان شۆری و پاکبووینەوە.

نزیـك ئێـوارێ بووینـەوە، (کـەریم) حەزیـدەکرد بزانـێ ئێمـەی کـورد چـۆن کەوتووینەتـە ناوچـەکەیانەوە.ئێمەش وامـان لێهـاتبوو، حەزماندەکرد، بەسەرهات و سەرگوزشتەی بەندکراوان بـزانین، زۆر حەزمدەکرد، بزانم (کەریم) بۆچیی بەندکراوە، ئەو کوڕە لاوە هـێمن وبێدەنگـە بۆچـیی بەنـدکراوە کـە وا خـۆی شـۆڕیبوو، ڕەنگوڕوخسـارێ سـوور و سـپیی، گـەلێ جوانبـوو بـە عـارەب نەدەچوو، لە سەر جێیەکەی ڕاکشابوو، خەیاڵ بردبوویەوە.

جێیەکەمان نزیك کەریم ڕاخستبوو.لە پرسیارکردن دەسپێشکەری لێکردین، گوتی لەوکاتەوەی هاتوون، دەمەوێ بپرسم، ئێوەی کورد بۆ گەیشتوونەتە ئێرە؟

ئەحمەد:چییت بۆ باسکەین، کاتێ زۆرمان دەوێ تا بەسەرهاتەکە دەگێڕینەوە.

بە بزەیەکەوە گوتی منیش بەسەرهاتی وا دووروودرێژم دەوێ.

ئەحمەد زۆری پێچوو، هەموو بەسەرهاتەکانی باسکرد تا ئەو شوێن و کاتەی لەگەڵ (کەریم) دانیشتبووین.

زۆر کاری تێکرد، یەکسەر ماچی ئەحمەدی کرد وگوتی تا ئێستە، مرۆڤی وەك تۆ خۆڕاگرو ڕۆشنبیرم نەبینیووە.

جگەرەی دابەشکردەوە، خۆیشی جگەرەی نەدەکوژانەوە.نەختێ بێدەنگی باڵی کێشایە ژوورەکە، پاشان ڕووم کردە کەریم گوتم بەسەرهاتی ئێمەت زانی، نۆرەی ئێمەیە بەسەرهاتت بزانین.

– من قاچاخچیی عەرەق و بیرەم، لەو ڕێیەی ئێوەوە دەچووین بۆ (سعودی)یە، بست بە بستی شارەزام، دەتوانم تەرمی پیرۆزیی کوڕی ئەحمەد بدۆزمەوە گەر پێم بڵێن چ ماڵە بەدوییێ بوو.

فایەق قسەکانی پێبڕی وگوتی وڵاتی سعودی ڕوگەی موسڵمانانە، چۆن خواردنەوەی کحولی لێدەفرۆشرێ؟!

– لەوشوێنە بە نرخێ گرانیش دەفرۆشرێ و ئارەزوومەندیی زۆرە.

ئەحمەد: زۆر ڕاستە، تەنانەت هەر کەس لەو بازرگانییە کار بکات زۆر دەوڵەمەند دەبێ.

وتم : تۆ دادگایی کراوی؟

– بەڵێ دادگایی کراوم، حەوت ساڵ زیندانیم بۆ دەرچووە، چاوەڕوانم بمبەن بۆ ئەبو غرێب.

سەرمان سوڕمابوو، حەوت ساڵ زیندانی لای ئاسایی بوو.
لەو کاتەدا (حوسێن) لە نێو خەوێکی قووڵدا بوو، کەمێ جوڵایەوە و پرخەکەی کەمبووەوە و گوتم باشە ئەی ئەو کوڕە قۆزە بۆچی گیراوە و تاوانی چییە؟
– ئەو کوڕە دەبینن چەند پاکوپوختەیە و چەندێ لە خەوێ قووڵ ّوشیریندایە، ئەو کوڕە دادگایی کراوە دەبێ لە سێدارە بدرێ. زۆر سەرسامبووین.فایەق زۆربە پەرۆشەوە، گوتی ئێستە ئەو کوڕە لە سێدارە دەدرێ و بەم شێوەیەش خەوی لێکەوتووە؟!!
– ئەوە جێی سەرسوڕمانی منیشە، هەموو ڕۆژێ مووی ڕوخساری هەڵدەکێشێ و دەچێتە گەرماو.
وریا: ئێوە سەیری دیوارەکە بکەن، چەند بە جوانی خاولی وجل وبەرگی پیاهەڵواسیوە.
ئەحمەد: مرۆڤ تا ئەو ڕۆژەی دەمرێ و تا دوا هەناسە، هیوای بە ژیان نابڕێ، ئەم کوڕەش تا پەتی سێدارە لە گەردنی دەنێن، هەر بە ئومێدی بڕیاری لێبوردن وهەواڵێ خۆشە تا ببێتە هۆی ئازادبوون ولە سێدارە نەدانی.
وتم: بۆچ لە سێدارە دەدرێ، تاوانی چییە؟
بە دەنگێ نەویەوە، گوتی ئەم (حوسێن)ە، کچ و کوڕێکی ئامۆزای خۆی کوشتوە.فایەق چاوەکانی کردەوە، زۆر بە سەرسوڕماوییەوە، بە دەنگی بەرز گوتی ئێستە، ئەمە دوو کەسی کوشتووە؟!

کەریم سەیریێ لای (حوسێن)ی کرد، زانی لە نێو خەوێکی قوڵایە، گوتی بۆی باسکردووم لە سەر ماف خۆی ئامۆزاکانی بە تەور کوشتووە.ئەم کورە لە منداڵییەوە، کچی (مامی)، لە لایەن مامیەوە پێشکەش کرا بوو، چەند ساڵێ لەمەوبەر ئەم حوسێنە باوکی دەمریێ وخۆی دەبێتە لێپرسراوی خێزان، لەم بارودۆخەی ئێستە کە هەژاریی ڕووی کردووەتە زۆربەی خەڵکی، ئەمانیش زۆر هەژار دەبن، بەڵام ماڵی (مامەی) بە هۆی ئەوەی کوڕێکیان لە دەرەوەی وڵاتە، گوزەرانیان زۆر باشە، دایکی، پێی دەڵێ کوڕەکەم بچۆرە لای مامت داوای کچەکەی لێبکە، با بە هۆی کچەکەیانەوە لە دەردی هەژاریی ڕزگاربین، (ئەم دەیگوت زۆرجار دایکم ئەم قسەیەی دووبارە دەکردەوە، بەڵام من حەزم نەدەکرد هەلی لەو شێوەیە بقۆزمەوە تا لە هەژاریی ڕزگارمانبێ، وێڕای ئەوەش مامەم کوێربوو، تەنیا ئەو کچەی هەبوو خزمەتی بکات، چونکە مامۆژنم نەمابوو)، بەڵام حوسێن لە لایەن دایکییەوە زۆری لێدەکرا، کە دەبێ ئەم کارە ئەنجامبدا و داوای ئامۆزاکەی بکات، ناچار بە قسەی دایکی دەکات، دەچێ بەرەو ماڵی مامی، کە دەچێتە ژوورەوە و سلاو دەکات، مامی وەڵامدەداتەوە، بەڵام کچەکە وەڵام ناداتەوە وبۆ مەتبەقەکە دەچێ.حوسێن بە مامی دەڵێ، هاتووم بۆ ئەو بەڵێنەی بە باوکمت دابوو، جێبەجێیبکەی، مامی دەڵێ کام بەڵێن؟ دەڵێ (شەیما)ی کچت، لە منداڵییەوە بۆ من دانراوە، ئێستەش هەر دووکمان گەورەبووین، دەمەوێ زەماوەند سازکەین،

مامی بە گاڵتەپێکردنەوە دەڵێ چۆن کچت بدەمێ؟ئێوە نان نییە بیخۆن، چۆن کچی من بەخێو دەکەی، کچەکەمیش ڕازی نابێ، جگە لەوەی ئێستە جاران نییە زۆری لێبکەم گەر بمەوێ بیدەمە شوو، ماڵێ، کە پیشانگەی ئۆتۆمبیلیان هەیە، چەندجارێ داوایان لێکردووم، گفتم پێنەداون.

ئەم قسەیەی زۆر پێناخۆشدەبێ، هەڵدەسێ، ئەچێ بەرەو مەتبەقەکە بە شەیما دەڵێ بە نیازنیت شووم پێبکەی؟

ئەویش بە شیوەیێ سووک تەماشای دەکات و دەڵێ، بە تۆ؟کەس نەما تۆ؟!

حوسێن دەڵێ بۆ من چییمە، تۆ و مامم ئێمە بە چیی دەزانن، شەیما دەڵێ ئێوە نان نییە بیخۆن.حوسێن دەڵێ ئێوەش نان نەبوو بیخۆن، بەڵام (جەوهەر)ی براتان چوو بۆ ئەوروپا، ئێستە کەمێ باشن، کچە دەڵێ تۆش ئازا بە، وەك براکەم بچۆ بۆ ئەوروپا، هەر لەم ڕۆژانەش دۆلارێ زۆری بۆ ناردینەوە.

حوسێن ئەڵێ کێ ئەڵێ درۆ ناکەی، تەنیا بۆ ئەوەی خۆتان دەوڵەمەند پیشاندەن تا شوو بکەی بە کوڕێ دەوڵەمەند.

شەیما بەو قسەیە تووڕە دەبێ و دەڵێ نەخێر، پارەیێ زۆر چاکمان لە نێو کەنتۆرەکەدا هەیە، بە کوێرایی چاوی ناحەزان و دوژمن.

لەم مشتومڕە دەبن، باوکی شەیما دەڵێ کچەکەم ئەوە چییە؟

شەیما دەڵێ بابە گیان، برازاکەتە هاتووە بۆ سواڵ.

حوسێن دەڵێ کە هاتوومە بۆ سواڵ، هەندێ لە دۆلارەکانم بدەرێ، شەیما دەڵێ بڕۆ دەرەوە، جارێکی دی نەتبینینەوە، گەر دەرنەچی ئێستە (جەبار)ی برام دێتەوە و هەر بە شەق دەرت دەکات.
ئەمیش ڕادەکا بۆلای کەنتۆرەکە تا شوێنی پارەکە بدۆزێتەوە و بیبا، (شەیما)، بەو تەورەی کە گۆشت وئێسکی پێووردەکرد، دوای کەوتبوو، کە ویستی دەرگای کەنتۆرەکە بشکێنێ و بیکاتەوە، شەیما تەورێکی لە دەستیدا وبریندار کرد، حوسێن بە ڕقەوە تەورەکەی لە دەست دەسێنێ، مێشکی دەوروژێنێ، بە پەلە دەرگای کەنتۆرەکە دەشکێنێ و پارەکە دەدۆزێتەوە، لەو کاتە مامەی بە خۆی وگۆچانەکەی دەچێت تا بزانێ کچەکەی بۆ زریکانی و لە پڕ دەنگی نەما، کە زیاتر چووە پێشەوەپێی لە سەری کچەکەیدا، زانی کچەکەی کەوتووەتە سەر زەوی، هاواریکرد وخۆی دایە سەر کچەکەی، دەیگوت حوسێنی برازام کچەکەی کوشتم، لەو کاتە، (جەبار)ی کوڕی دێتەوە، کە ئەم کارەساتە دەبینێ، پەلامارحوسێن دەدا، ئەمیش تەورەکە هەڵدەگرێ ومێشکی (جەبار)یش دەپژێنێ، مامی چەندێ گۆچانەکەی رادەوەشێنێ، سوودی نابێ وحوسێن خۆی دەرباز دەکات، دەڕواتەوە بۆ ماڵ، دەزانێ چاری نییە ودەیگرن، ڕادەکات بەرەو باکوور، بەڵام زاڵگەکان ئاگاداردەکرێنەوە، لە زاڵگەی نزیک پایتەخت، دەیگرن، پاش ئازاروئەشکەنجەدان، دان بە تومەتباری خۆی دەنێ ودادگا بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەردەکات.

باسکردنی ئەم بەسەرهاتە هەمووانی بەنج کردبوو، بەسەرهاتی خۆمان، زۆر سادەوساکار دەهاتە پێشچاو.وتم هەژاریی دەردێ گرانە، گەر لەبەر نەبوونی نەبوایە، ئەم کوڕە قۆزە، ئاوڕی لە هەموو کچێ نەدەدایەوە.

کەریم: ئیمامی عەلی (خوا لێی رازی بێ) دەفەرموێ:( گەر هەژاریی کەسێ بوایە، دەمکوشت).

کات درەنگیکرد، خەومان نەدەهات، ئەو بەسەرهاتە خەوی لێزڕاندین.

# سەردان

بەیانی زۆر زوو، بێئەوەی هەستم پێبکات، تەماشام دەکرد، لە ژێر جێیەکەی ڕاستبووەوە، سەیریێ چوار دەوری خۆی کرد وهەستایە سەرپێ ، ژوورەکەی کرد بە گۆڕەپانی وەرزش، هەموو جۆرە وەرزشێ سویدیی کرد، پاشان خاولییەکەی خستە سەر شانی وچوو بەرەو گەرماوەکە، لەگەڵ خۆشتن، منگەیەکی لێوە دەهات وبە هێمنی گۆرانی دەچڕی، کە تەواو بوو، بە نوزە نوزی گۆرانی وتنەوە هاتەوە، ئیدی بێدەنگبوو.

ڕۆژی سەردانی بوو، ئەوەندەی چاوەڕوانیی کەسوکاری ئەو بووم، بیرم لای کەسوکاری خۆم نەمابوو.

سەردانی کەریم هات، ئەم پەرۆشتربوو، سەیری دەرگای مەرکەزەکەی دەکرد، لە پڕ ڕەنگی کەمێ گۆڕا، بە ڕەنگی زانیم کەسێ خۆی بینیووە.

ژنێ عەبا لە سەر، ڕوو لە ژوورەکەی ئێمە دەهات، لەگەڵ نزیک بوونەوەی، حوسێن ڕەنگی گەشتردەبوو، کە تەواو نزیکبووەوە، دەستیکرد بە گریان، ئەمیش خۆی نوسان بە شیش بەندەکەوە، بە بێدەنگ، دەستی لە دەستی دایکی نزیکدەکردەوە، هیچیان

نەیانتوانی پتر بە پێوە بوەستن، دانیشتن، بەرانبەر یەکدیان گرتبوو، بە چاوی پڕ فرمێسك، هەر سەیری یەکدییان دەکرد، حەپەسابوون وهیچیان نەدەگوت، حوسێن سەری داخست، دایکی ئەشکی دەباران وبە لاواندنەوەوە دەیگوت (کوڕەکەم من بە تۆم کرد، گەردنم ئازاکە)، سەری هەڵبڕی ودەمی برد، یەکە بە یەکەی پەنجەکانی دایکی ماچکرد، بە هێمنی دەگریا، ئاگاداری ئێمە نەبوون، وایاندەزانی کەس ئاگای لێیان نییە، گوتی دایکە گیان، زۆرم نەماوە بمبەن بۆ لە سێدارەدان، توخوا دایکە گیان تۆ گەردنم ئازاکە، نەوەك جارێکی دی نەتبینمەوە.دایکی قوڕگی گیرا، نەیتوانی هیچ قسە بکات، دای لە پرمەی گریان، هاواری دەکرد و دەیگوت تاوانبارم، من تاوانبارم.لەو کاتە دەنگێ هات، (ماوەی سەردانی تەواو).خۆیان پتر بە شیش بەندەکەوە نوسان، حەزمدەکرد، شیش بەندەکە بکرێتەوە، بە ویستی خۆیان باوەشیان لە یەکتر بدایە، تا دڵیان ئاوی دەخواردەوە یەکتریان بگوشیایە.

(س. ع)ە توڕەبوو لێیان، گوتی لەگەڵ ئێوەم نییە سەردانی تەواو؟ دایکی وتی توخوا تووڕە مەبە، ئەوڕۆ وسبەی لە ژیان ماوە، ماڵاواییمان لێدەکات.

س. ع گوتی با تاوان نەکات و لە سێدارە نەدرێ.

گوتی من تاوانبارم، توخوا لێی تووڕە مەبە، دەڕۆم، دوا سەرنجی لە کوڕەکەیدا و سەیریکردین وگوتی حوسێن بێتاوانە، من

تاوانبارم، من ئەو کارەم پێکرد، لەبەر هەژارییمان، من هەقم سێدارەیە نەك کوڕەکەم.

توخوا براکانم ئاگاداری بن.هەستایە سەرپێ، عەباکەی خستەوە سەری و ڕۆیشت، تا گەیشتە دەرگا، چەند جارێ ئاوڕیدایەوە، (حوسێن)یش دەستی بە شیشەکەوە بوو، هەر سەیری دایکی دەکرد، تا دیار نەما و چووە دەرەوەی مەرکەزەکە.

سەری نایە سەر قۆڵی، چەندجارێ چاوەکانی بە قۆڵی کراسەکەی سڕیەوە، کە ئاوڕی دایەوە و بینی بە سۆز و بەزەییەوە سەرنجی دەدەین، وەك منداڵ، خۆی گەیاندە ئامێزی کەریم، گوشییە خۆی، گوتی دڵم دەڵێ ئەمە دواجار بوو دایکم تێیدا بینی.

کەریم وتی ئینشەڵلا وا نابێ، کێ دەڵێ لێبوردن دەرناچێ وئازاد نابی.گوتمان کەریم ڕاستەکات، کێ دەڵێ وانابێ.

خۆی لە ئامێزی کەریم کردەوە، زانی قسەکانمان تەنیا بۆ دڵنەواییە.بێهیوا، خاولیەکەی نایە سەرشانی وچوو بەرەو گەرماو وجێیهێشتین.

سەردانیمان هات گوتیان ئەم هەفتەیە ئەبو مونا بە کەفالەت دەرتان دەکات.

## سێداره

دوو ڕۆژی مابوو بۆ سەردانی، حوسێن گوتی تەنیا ئەمجارە دایکم ببینم ئەوسا بیانبردمایە بۆ سێدارەدان زۆر ئاسایی بوو، چونکە من خۆم بە تاوانبار دەزانم کە دەستم لە دوو ئامۆزای خۆم چوو و کوشتمن، گەر سێدارەم بۆ دەرنەچووایە، ڕۆژێ لە ڕۆژان ویژدانم دەیهەژانم، خۆم دەکوشت، چونکە تاوانی کوشتنی کەسێ زۆر گەورە وگرانە، نەخوازەلا ئامۆزا.

دیاربوو لەو کەسانە نەبوو، پیاوکوژی بکات، زۆر بەڕێز و بە ویژدان بوو، بەڵام نالەباری بژێوی ژیان و دایکی، هاندەری بوون تا هەستێ بەم تاوانە.

ئەو ڕۆژە کەمێ هیوای پەیداکردبوو، کە دایکی ببینێتەوە.

نزیك نیوەڕۆ بوو، بە پەلە دەرگای مەرکەزەکەیان کردەوە، ئۆتۆمبیلێ شێوە فریاگوزاری (ئەمبولانس)ڕەش هاتە نێو مەرکەزەکەوە و ئەفسەرێ بە(پلەی ڕائد) دابەزی، چوار پۆلیس دەرگای دواوەی کردەوە، بە پەلە دابەزین، هەر چوار پۆلیسەکە، وەك ئەوەی بە مشار بڕابنەوە هاوبالا و چوار شانە و سمێڵ ئەستوور بوون، حوسێن لە شوێن خۆی وشکبوو، قوڕاگەی سەر و

خواری دەکرد، بە دەنگێ زۆر نەوی و لەرزۆکەوە گوتی ئەمانە هاتوون بمبەن بۆ سێدارەدان!!گوتم مەرج نییە، لەوانەیە میوانی مەرکەزەکەبن، یا بزانە چ بەندکراوێ نەخۆشە وهاتوون بیبەن بۆ نەخۆشخانە.گوتی کاکە وانییە، هەر ئەمانەبوون دەهاتن و بەندکراوانیان دەبرد بۆ گرتووخانەی گشتی ئەبو غرێب.

وریا: گەر ئەوانیش بن، کێ دەڵێ بۆ لای تۆ هاتوون، چیی زۆرە بەندکراو زۆرە.

دەمانویست دڵی هێورکەینەوە، بێسوودبوو، سەری لێشێوا بوو، نەیدەزانی چیبکات، چووە گەرماوەکە وهاتەوە، سەیرێ ئۆتۆمبیلەکەی دەکرد، دەگەڕایەوە بۆ گەرماوەکە.

(س. ع)ی مەرکەزەکە لە ژووری بەڕێوەبەری مەرکەزەکەوە دەرکەوت، نوسراوێکی بە دەستەوە بوو، لەگەڵ ئەو پۆلیسانەی هاتبوون، وتووێژیان دەکرد وجاروبار سەیری ژوورەکەی ئێمەیان دەکرد، زانیم بۆ حوسێن هاتوون.

(س. ع) و سێ پۆلیس، ڕوو لە ژوورەکەمان هاتن، نەیتوانی خۆی بە پێوە بگرێ، هێزی ئەژنۆی شکا، لە شوێنی خۆی دانیشت.

(س. ع)، بە پەلە دەرگای کردەوە، گوتی (حوسێن عەلی)، وەرە دەرەوە، بێدەنگبوو، وەڵامی بۆ نەدرایەوە، پۆلیسێ لە پۆلیسەکان بە تووڕەییەوە گوتی پەلە هەستە و وەرە پێشەوە.

(س، ع) گوتی هەستە، ئەمانە بۆلای تۆ هاتوون.بە چاوەکانی سەرنجیانی دەدا، لاڵببوو، هیچی نەدەگوت، کەریم لێی چووە

پێشـەوە، تەماشـایێکی کـرد وگـوتی کـەریم بـۆ سـێدارەم دەبـەن، حـەزم دەکـرد بـۆ دواجـار دایکـم ببینیایـە، بـە گریانـەوە دەیگـوت توخوا پێیان بڵێ با نەمبەن تا دوو ڕۆژی دیکە.

دوو پۆلیســەکە هاتنــە ژوورەوە، کەلەپچــەیان کــردە دەســتی، بــە پەژارەییــەوە دەپاڕایــەوەو دەیگـوت توخـوا وازم لێبێـنن بـا دایکـم جارێ دیکە ببینمەوە.

کەریم وتـی تـا دوو ڕۆژی دی مەیبـەن، با لـە دوا سـەردانی، دایکـی ببینێ.

پۆلیسەکە گوتی بۆ بە ئارەزووی ئێوەیە، هـەر ئـەوڕۆ دەبـێ بگاتـە بەندیخانە و سبەینێ دادگایی کردنەکەی جێبەجێبکرێ.

زۆر بێویژدانانە گرتیان بە قۆڵیدا و هەڵیانسان، یەکیان گوتی دوو کەسی کوشتووە، دەیەوێ بەم فێڵانە خۆی رزگار بکات.

بردیانە دەرەوەی ژوورەکە و دەرگایان داخست.نەیدەتوانی هەنگاو بنێ، ئەوانیش هێند بە تونـدی ڕاپێچیان کـرد، هـەر دوو پێـی گـۆج ببـوو ودەخشـا بـە سـەر کـۆنکرێتی گۆڕەپانەکـە، دوا وشـەی سـەر زبانی، "دایە ، دایە بوو".گەیاندیانە لای ئەمبولانسـەکە، دەستیان لــە کەلەپچــەکە کــردەوە، پۆلیســێ لــە نێــو ئەمبولانســەکە لــە چــاوەڕوانیی بــوو، گرتــی بــە قــۆڵی و ڕایکێشــایە نێــو ئەمبولانسەکەوە ، ئەمجارەیان بە کەلەپچەیێ تایبەت، دەستیان بە شیشێکەوە بەست، کە تایبەت

دروستکرا بوو بۆ ئەو کەسانەی سێدارەیان بۆ دەردەچێ.

دوا سەرنجیدا، بەڵام ئەوان بە پەلە دەرگای دواوەیان داخست.
(ڕائیدەکە) ولێپرسراوی مەرکەزەکە هاتنە دەرەوە، (س، ع) بە دوایانەوە بوو، زۆر بە پەلە دەرگای مەرکەزەکەیان لێکردنەوە، ڕائیدەکە وپۆلیسەکانی سواربوون وشوفێر پێی لە بەنزین نا و بە تیژی چووە دەرەوە، دەرگای مەرکەزەکەیان داخست.
پاش دوو ڕۆژ، کاتی سەردانیبوو، دایکی لە دەرگای مەرکەزەوە بە هەڵەداوان بەرەو ژوورەکەمان دەهات، هەر پێنجمان لە بری حوسێن لە پێشوازیی بووین، بینی کوڕەکەی دیار نییە، وەك شێتی لێهات، هاواری کرد وگوتی کوڕەکەم کوا، لە کوێیە؟!!
کەریم گوتی گوسترایەوە بۆ بەندیخانەی گشتی.
دای بە دەموچاوی خۆیدا، کەوتە خۆڕنینەوە، دەیگوت کوڕەکەمیان بۆ سێدارە برد.
ئەحمەد: دایە گیان، مەرج نییە هیچی لێبکەن، بەڵام دەبێ بچیێ بۆ بەندیخانەی گشتی.
(س. ع) گوتی سەردانی تەواو.
کەریم بە (س.ع)ی گوت بۆ بەم ژنەتان نەگوتووە کوڕەکەت گواستراوەتەوە؟
گوتی نازانم، کتوپڕبوو، بەڵام پێویست بە وتن ناکات.
کەریم: دەرگاکە بکەوە با کەلوپەلەکانی بدەینەوە دەستی دایکی.
(س. ع) دەرگاکەی کردەوە.کەریم کەلوپەلەکانی دایە دەسی

دایکی. یەکجاری هاواری لێبڵند بوو، بۆنی خاولیوجلەکانی دەکرد ودەیگوشییە خۆی و فرمێسکی دەباران.

کەریم وتی دایە، بڕۆ خۆت بگەیەنە پایتەخت، بەڵام توخوا هەواڵمان پێبگەیەنەو سەردانیمان بکە، ئێمەش وەك حوسێنی کوڕتین.

بە گریانولاواندنەوە بەرەو دەرگای مەرکەزەکە ڕۆیشت و دەیگوت، (کوڕەکەم تاوانبار نییە من تاوانبارم، من ئەو تاوانەم بە کوڕەکەم کرد، من پێمکرد، من تاوانبارم، دەبێ من لە سێدارە بدرێم).

حەزمدەکرد جارێکی دی ئەو دایکە ببینینەوە، بۆ دوا هەواڵی کوڕە تاقانەکەی، بەڵام پاش دوو ڕۆژ، کاتی نیوەڕۆ هاتن وبە کەفالەت ئازادیان کردین، لە گۆڕەپانی مەرکەزەکە وەستابووین، تەماشای ژوورەکەی خۆمانم دەکرد، حوسێن لای دەرگای ژوورەکە وەستابوو وپێی لە سەر زەوی نەمابوو، پەتی سێدارە لە ملی ئاڵابوو، ئەو زبانەی لە مێژ بوو لە ترس و تۆقینی ناکاو لاڵ ببوو، هاتبووە گۆ دەیگوت من بێتاوان بووم، تاوانەکە تاوانی من نەبوو، تاوانی هەژاریی بوو، چاوەکانی کرابوونەوە، وەك ئەلبوومێ، وێنەی دایکی تێدا هەڵگرتبوو بۆ تا هەتایی لە چاوەڕوانییدا بوو، بۆ دواجار پشوویدا، بە ئاسوودەیی سەری نایەوە و لە نێو گۆڕیدا بە ئارامی لێڕاکشا.

لە هەموو ژووری بەندیخانەکەوە، بەندکراوان دەسیان بەرز کرد بووەوە دوا ماڵاواییان لێکردین.

چووین بۆ ماڵی (ضیا)، لە چاوەڕوانیدا بوون، پیرێژنەکەی دایکی ضیا، یەکە بە یەکەی ماچکردین، دراوسێکانی ماڵی ضیا، سەردانییان دەکردین.

دیاربوو گوزەرانیان زۆر باشبوو، لە خانوویێ ڕۆژاوایی دەژیان، باخێ زۆر خۆش لە حەوشەکەیان بوو، زۆر خۆیان ماندووکردبوو، خواردنێ زۆریان کردبوو، تەنانەت بانگێشتی دراوسێکانی کردبوو، پەرۆشی وخۆشحاڵییان وەك برایێ دڵسۆز دەهاتە پێشچاو.

دووەمین ڕۆژ بە ئۆتۆمبیلەکەی (ضیا) چووین بۆ ماڵی (ئەبو مونا) پاشان چووین بۆ شاری (سەفوان)، گەیشتینە نێو شارەکە، چووین بەرە و مەرکەزەکەی ( نەقیب ئیبراهیم)، پۆلیسەکان هەموو کۆبوونەوە و پیرۆزباییان لێکردین و گوتیان نەقیب چووە بۆ لای ملازم عەلی، زۆرمان پێخۆشبوو، کە هەردووکیان بە یەکەوە دەبینین. پۆلیسەکانی ئەو مەرکەزەش خوشحاڵی خۆیان دەربڕی و کەوتنە پێشمان بۆ ژووری ملازم عەلی، کە چووینە ژوورەوە سەریانسوڕما، ملازم عەلی وتی بە ڕاستی سەلماندتان کورد دڵسۆز وبە وەفایە، چەندین کەس لەم گوزەرە پیاوەتیی وهاوکاریمان کردوون، کەچی لە بازاڕ دەمانبینن چاویان دەشارنەوە و خۆیان گێلدەکەن.

گوتم : پیاوەتی و مرۆڤایەتیتان لە یادناچێ.

زەنگێکی لێدا ، یەکسەر پۆلیسێ هاتە ژوورەوە، پێیگوت بۆ ئەم میوانە ئازیزانە چا بێنە.

نەقیب ئیبراهیم: ئەی مفەوەز جەربوع لە کوێیە؟

لەگەڵ قسەکەیدا بە کۆمەڵێ فایلاتەوە هاتە ژوورەوە سلاوی سەربازی کرد.

نەقیب: ئێستە باسی تۆمان دەکرد.

جەربوع : بە باشە یا بە خراپە؟

نەقیب : نە بە باشە، نە بە خراپە، تەنیا هەواڵپرسین بوو.

ملازم: ئەی نازانی ئەمانە ئازادبوون؟

نەقیب: ئەمانە تێکدەرن وانییە مفەوەز جەربوع؟!

هێند شەرمەزاربوو، ڕەنگی مردووی لێنیشت، حەزیدەکرد زەوییەکە هەڵیلوشێ وبچێتە ناخییەوە، وەلامی (نەقیب)ی بۆ نەدرایەوە.

ئەحمەد: گلەیی لێناکرێ، ئەرکی سەرشانێتی، بەلام گلەییم هەیە کە هەموو پیرۆزباییان لێکردین، تەنیا مفەوەز جەربوع نەیکرد.

ئەویش گوتی پیرۆزباییتان لێدەکەم.فایلەکانی لە سەر مێزەکە هەڵگرت وبە پەلە چووە دەرەوە.

پاش دانیشتنێ زۆر، مالاواییمان کرد و چووینەوە بۆ ماڵی ضیا، لەوێش مالاواییمان لەو خێزانە بە ئەمەك و دڵسۆزە کرد.

# وێستگەی شەمەندەفەر

چووینە وێستگەکەوە، من و وریا بە پەلە چووینە ڕیزی پلیت بڕینەوە، کە گەیشتە نۆرەمان، تەنیا پلیتی بە (پێوە وەستان) مابوو، بە ناچاری شەش پلیتمان بڕی، چونکە شەمەندەفەری دوای ئەم دوو کاتژمێری پێدەچوو، پاشان دەردەچوو.
چووینە شەمەندەفەرەکەوە وبە پێوە وەستاین، پرسیارم لە یەکێ لە سەرنشینەکان کرد گوتم بە چەند کاتژمێر دەگاتە پایتەخت؟
گوتی دوازدە کاتژمێر.
گوتم :وریا وا چاکە بچین بۆلای کچە پلیت بڕەکە، تا هاوکاریمان بکات وپلیتی (دانیشتن)مان پێبدا، گەر لەبەر خۆمانیش نەبێ، لەبەر باوکت، چونکە توانای نییە تا پایتەخت بە پێوە بوەستێت.
– با بچین بزانین چییمان پێدەکرێ.
باوکی وریا وتی مەچن، دەتوانم بە پێوە بوەستم، نەوەك دەسبکات بە ڕۆیشتن.
گوتم :دەچین، هەوڵێکە و ئەیدەین.
هەردووکمان چووین بۆلای پلیت بڕەکە، باسەکەمان بۆ کرد، (زینـدانی بووینـە و تـازە لـە بەندیخانـە ئـازادبووین، دوو بـە

سالاّچـوومان لەگەڵدایـە).گـوتـی پلیتـەکانم بدەنیّ، ئێمـەش پلـیتی هەردووکمان دایە دەستی و کردی بە پلیتی (دانیشتن).
گوتی بچن چوار پلیتەکەی دیکە بێنن.
هەر بە پەلە چووین بۆ لایان و گوتمان ئەوەی ئێمەی کرد بە بلـیتی (دانیشـــتن)، (گـــوتی بچـــن بلیتـــەکانی دی بێـــنن)، ئـــەوانیش بلیتـــەکانیان پێـــداین، گوتیـــان پەلـــە بکـــەن شـــەمەندەفەرەکە لـــە ڕۆیشـتنایە. بلیتـەکانی ئەوانیشـمان کـردە بلـیتی دانیشـتن، کـە گەڕاینەوە شەمەندەفەرەکە لە شوێنی خۆی نەمابوو، ڕامانکردن بە دوویـدا تـا بیگـەینیّ، بـەلاّم نەگەیشـتین و هـەردووکمان جێمـاین، چووینەوە بۆلای کچە بلیت بڕەکە، بەلاّم خـەڵکی ڕیـزی بەستبوو، بۆ بڕینی بلیتی شـەمەندەفەرەکەی دیکە، ناچار چووینە ڕیـزەوە، کـــە نۆرەمـــان هـــات کچـــەکە ناســـینیەوە وگـــوتی ئـــەی ئێـــوە نەڕۆیشتوون؟
گـوتم:تـا گەیشـتین شـەمەندەفەرەکە دەرچـووبوو، ویسـتم باسـی بەسەرهاتەکەمان بکەم، کە چۆن ڕامانکرد بە دوایان، بەلاّم کچیّ لە ڕیزی ژنانەوە، قسەکەی پێبڕیم، گوتی نـۆرەی منـە، سیّ بلـیتی بۆ بڕی و دوو بلیتی ئێمەشی بڕی وگوتی کاکـە، ئەمجارە جێنـەمێنن، نزیك دوو کاتژمێری دیکە دەردەچیّ.
چـــووینە گۆڕەپـــانی وێســـتگەکە، پیاســـەمان دەکـــرد، کـــات نەدەڕۆیشـت، نەمانـدەزانی خۆمـان بـە چییەوە خـەریك بکـەین، چووینە بازاڕە خنجیلەکەی وێستگەکە، تەماشای کەلوپەلـەکانمان

دەکـرد، خۆزگـەم دەخواسـت، بمتوانیایـە بـە ئـارەزووی خـۆم کەلوپـەل هەڵبـژێرم وبیکەمـە دیـاری بۆخۆشەویسـتانم.لە کـاتی تەماشاکردنی شتومەکدا، ئەو کچەی لە بلیت بڕیندا نۆرە بڕیـی لێکردین، لەگەڵ هاوڕێکەی، جاروبار تەماشایان دەکردین، بەڵام ئێمـە دڵمـان مردبـوو، پـەژارە وخەمـەکانی ژیـان هـەموو دیمـەن ونیگـای جـوانی لـە پێشچـاو خسـتبووین، سـەیرمکردن، یـەکیان زەردەخەنەیـەکی بـۆ کـردم، ڕووم وەرگێـڕا و چـاوم لێشـاردەوە، چرپاندمە بنگوێی وریا وگوتم ڕاستەوخۆ ئاوڕ مەدەرەوە، ئەو دوو کچە زۆر سەیردەکەن، وریا لەگەڵ تەماشاکردنی پێشانگەکە، بە ئاسپایی ئاوڕی لێدانەوە.

گـوتم : بـا لێـرە بـڕۆین وبچـینە گۆڕەپـانی وێسـگەکە، ئەمانـە واز ناهێنن، هەر شەرمیان نییە.

گوتی :ئەزانی زۆر جوانن؟!.

قۆڵم خسـتە نێـو قـۆڵی وریـاوە گـوتم: "کـەس بە تەماشـا نـابێ بە پاشا"، با بچینە خوارەوە.

لـە سـەر کورسـییێ لـە کۆنکریـت دروسـتکراو، دانیشـتین، لـە چاوەڕوانیی کاتی دەرچوونی شەمەندەفەرەکە بووین.

- وریا دەبێ ئێستە چییمان پێبڵێن؟

- چییمان پێدەڵێن، لەوانەیە بزانن کە کوردین.

- باسـی ئـەو کچـانە ناکـەم ، وا بـزانم هـەر دڵـت لایانـە، مـن دەڵێم دەبێ ئێستە باوکت چییمان پێبڵێ؟

پێکەنی و گوتی وامزانی باسی ئەو دوو پەرییە دەکەیت، باوکم، دەزانێ لەبەر بەرژەوەندی ئەوان وامانکرد، بە بزەیەکەوە، گوتی سامان گیان، کەس نازانێ خێر لە چییدایە.
لەو کاتە هەردوو کچەکە دەهاتن، زۆر ترسام ئاخۆ دەبێ بۆچیی ڕوو لە ئێمە بێن، بە پێشماندا تێپەڕبوون، چوونە لای ئەو پیاوە پیرەی لە کورسییەکەی نزیکمانەوە دانیشتبوو.
وریا: پێدەچێ ئەو پیاوە پیرەیان لەگەڵدابێ.
- کاتی بلیت بڕین، ئەو کچە سێ بلیتی بڕی.
دیسان ویستیان سەرنجمان ڕابکێشن.
- وریا هەستە با بچینەوە بۆ بازاڕەکە، ئەمجارە بە ئارەزووی خۆمان سەیری کەلوپەلەکان دەکەین.
لە بازاڕەکەش بێزاربووین، هەر کات نەدەڕۆیشت، هاتینەوە نێو گۆڕەپانەکە، بەڵام دوور لەوانەوە پیاسەمان دەکرد.
لە بڵندگۆوە بانگەوازیانکرد، ڕۆیشتنی شەمەندەفەرەکەی ڕاگەیاند، سەرنشینەکان هەموو بەرەو شەمەندەفەرەکە دەڕۆیشتن، چووینە فارگۆنی ژمارە دوو، بە پێی بلیتەکە ژمارەی کورسییەکەمان دۆزییەوە ودانیشتین، دووکچەکە وپیاوە پیرەکە هاتنە فارگۆنەکەوە لە ژمارەی کورسییەکان دەگەڕان، ژمارەکەیان، دوو کورسی بەرانبەرمان، کورسیێ پشتمانەوە بوو، هەردووکیان لە بەرانبەرمان دانیشتن، بەساڵاچووەکەیان، لە پشت کورسییەکەی خۆیانەوە دانیشاند.

دەمویست ژمارەکەمان بگۆڕمەوە، بەڵام شەرمم دەکرد، دڵنیابووم گەر بە هەر کەسێکم بووتایە بۆ گۆڕینەوە، زۆر سوپاسی دەکردین، چونکە زۆربەیان چاویان لە شوێنمان بڕیبوو وخۆزگەیان بە ئێمە دەخواست.کەوتە هۆڕن لێدان و تەپە تەپی ڕۆیشتن، تا لە وێستگە چووە دەرەوە وملی ڕێی گرت بەرەو پایتەخت.

چاوم لێدەشاردنەوە، دەمویست خۆم بکەمە خەو، دوو کاتژمێر لە بێدەنگی، تەنانەت لەگەڵ وریا نەمدەوێرا قسە بکەم، دەترسام ئەوانیش بکەونە ئاخاوتن لەگەڵمان، چونکە بێشەرمییان پێوە دیار بوو.تەماشای لای وریام کرد نەخەوتبوو، لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد، تێکەڵی مانگ و ئەستێرەکان ببوو. نووکی پێڵاوەکەی لە نووکی پێڵاوەکەم توندکرد، تەزوویێ بە لەشمدا هات، خۆم لێگێلکرد، چاوم نوقاند، سەرم داخست وخۆم کردەخەو، چەندجارێ دووبارەی کردەوە، سەرم هەڵبڕی وچاوم کردەوە، کەمێ خۆم جولاند وپێم هێنایە دواوە ولە پێی دوورم خستەوە، بە هێمنی پێڵوی چاوم نایە سەر یەك تا کەمێ چاوم گەرمکەم.

نێو فارگۆنەکە هێمن بوو، تەنیا پرخەی سەرنشینەکان دەهات، ئەم هێمنییەی بە هەلزانی، سەرەڕای پێ دوورخستنەوەم، دیسان نووکی پێی گەیاندەوە پێم، چاوم کردەوە، دەمویست بڵێم وازم لێبێنە، بە زەردەخەنەیێ وەلامی دەدامەوە، جاروبار چاوەکانم بە ئاسپایی دەکردەوە، هەموو جارەکان ئەو چاوی بڕیبووە نێو

چاوم، پاسەوان بوو بۆ تەماشا پچڕ پچڕەکانم، هەموو جارەکان بە خەندەیێ جوان، وەڵامیدەدامەوە.

لاڵی کردبووم کە بڵێم وازم لێبێنە، وێڕای ئەوەی جوانییەکەی کاری بوو، دەمویست لە بیری خۆمی ببەمەوە، لە شاشەی پێشچاوم لایبەم وبە خەیاڵی ناخۆش، خەم و پەژارەیی و ئازارەکانی ژیانم، سەر ئەو شاشەیە داپۆشم، بەڵام هەستەوەرەکان ئۆقرەیان لێبڕیبووم، تینووی بینینی ئەو شۆخەیان بوو، چونکە جوانییەکەی زۆر بێوێنەبوو.

قژە مۆر وخاوەکەی، خەرمانەی لە چوار دەوری ڕووە مانگ ئاساکەی کردبوو، نیگای چاوەگەش و ڕەشەکەی جوانتر کردبوو، پتر چاوەکانم نەیاندەتوانی خەوە درۆزنە بکەن، پێڵوەکان، نەیاندەتوانی یەکگرنەوە وچاوەکان لە بینینی ئەو پەرییە بێبەشکەن.ئەمجارەیان پێی هێنایە پێشەوە، نەمتوانی پێم دوور بخەمەوە، چاوەکانم کردەوە وزۆر بە جوانی سەرنجمدا، زەردەخەنەکەی، جوانی چاوەکانی پتر دەرەخست، هەستم بە لەرزینێ دەکرد، لە پڕ ئارەق کردنێ، دڵم ئاو دەدرا و هەستەوەرەکان تینویەتییان پێئەشکا.تەماشایێ سەرنشینەکانم کرد، زۆربەیان ملیان لار ببووەوە، تەنیا دەنگ، پرخەی سەرنشینەکان بوو، گڵۆپی سووری نێو فارگۆنەکە، کەشێ ڕۆمانسی دروست کرد بوو، بێترس، بێشەرمانە، سەرنجی تەواوی چاوەکانیمدا، کوڵمەکانی لەبەر ناز و شەرمە نازاوییەکەی،

سوور هەڵگەڕان، سەرنجمدایە گەردنی سپیی، پاشان، ئەو دوو قۆڵی ناسکی سپییەی کە بە قژە ئاوریشمییەکەی داپۆشرابوون، حەزم نەدەکرد پەلە بکەم لە سەرنجدان، دەمویست بمێنمەوە لە تەماشاکردنی هەر شوێنێکی، چاوەکانم بۆ نەدەپروکا، تا بە جوانی و تەواویی فریای بینینی بکەوم، لەبەر خەندەکەی، لێوانی ئاڵی یەکتریان نەدەگرتەوە ودانە مروارییەکانی نەدەشاردرایەوە، بە ئاسپایی دەستی لەرزۆکم بۆ دەستەکانی برد، زۆر بە ئاسانی دەستی هێنا، دەستەکانی لە نێو دەستم جێی خۆیان کردەوە، لەبەر ناسکی و نەرمی، هەستم نەدەکرد ئەو دەستە ئێسکی تێدابێ، دڵم نەدەهات بیگوشم، نەوەك باڵ پەپوولە ئاسا هەڵوەرێ، سەرنجمدایەوە، گەیشتبوومە دووبەی، لە نێو قژە خاوەکەیدا خۆیان شاردبوەوە، شەرمیان دەکرد بجوڵێنەوە، نەوەکو لە یەکدی بکەون، وەك بەردە ئەستێ ئاگر بکەنەوە، زۆر پەشیمان بووم بە شاردنەوەی چاوەکانم لە بینینی ئەم جوانییە، نەمدەزانی یەزدان چۆنی دروستکردووە !

وامدەزانی کەس لە فارگۆنەکە نییە، هەستم نەدەکرد وریا لە تەنیشتمەوەیە، کە سەیری لای وریام کرد، تەماشای کردم و بزە پێکەنینێکی بۆ کردم، سوورهەڵگەڕا، شەرمی لێکردم، منیش شەرمم دەکرد، چونکە لە یەکتر ئاشکرا بووین.

شەمەندەفەرەکە لە وێستگەیێ وەستا، کچێکیان گوتی باوکە، دادەبەزی یا شتێکت بۆ بێنین؟باوکی گوتی دانابەزم، هیچ مەهێنە.

هەر چوارمان، وەك دوو خێزان، دابەزین و لە کافتریای وێستگەکە ساردیمان خواردەوە، زۆر هەوڵماندا کە ئێمە پارەکەیان بدەین، بەڵام نەیانهێشت، ئەوەندەی لە نێو شەمەندۆفێرەکە بووین، هەرچوارمان لاڵببووین و هیچ پرسیارمان لە یەکدی نەکردبوو.

وریا گوتی ئەرێ ئێوە ناوتان چییە؟گوتیان ئەمیرە و سەمیرە.

گوتم: ئێوە جمکانە نین؟

ئەمیرە:زۆر کەس وا دەڵێ، بەڵام من یەك ساڵ گەورەترم.

وریا: زۆر شێوەتان بە یەکتر دەچێ.

ئەمیرە: ئەی ئێوە ناوتان چییە؟

گوتم :من سامان و ئەویش وریا.

بە ناوەکان، پتر بۆیان دەرکەوت کە کوردین.

سەمیرە: ئێوە چیی دەکەن لێرە؟

وریا: ئێمە لە زیندان بووین، تازە ئازادبووینە.

ئەمیرە: بۆ بەندکرابوون؟

گوتم:لە سعودییەوە سنوورداش کراین، لە ڕێی گەڕانەوە لە لایەن مەفرەزەیەکی عێراقەوە گیراین.

لەو کاتە شەمەندۆفێرەکە لە ڕۆیشتندا بوو، بە پەلە سەرکەوتین. ئەمجارەیان ئەمیرە لە تەنیشتم دانیشت وسەمیرە لە تەنیشت وریا.من و ووریا بەرانبەر یەکدی و لای جامەکەوە دانیشتبووین، تەماشای دەرەوەمان دەکرد، گوتم وریا سەرنجی مانگەکە بدە چەند سەرنج ڕاکێشە.

- بەڵێ مانگە شەوێ زۆرجوانە، دەزانی ئەوەی کە مانگ سەرنجی ڕابکێشێ، کەسانێکی ئاشقن وحەز بە جوانی دەکەن.
- لە ناخی دڵەوە حەز بە شتی جوان دەکەم، بەڵام بارودۆخی ناهەموار، شتی جوانی لە پێشچاو خستووین، وای لێکردووین چاومان بشارینەوە لە شتی جوان.
ئەمیرە و سەمیرە هەر سەیریان دەکردین، تێنەدەگەیشتن باسی چیی دەکەین.
ئەمیرە: ئێوە باسی چیی دەکەن، لێتان تێناگەین؟
وریا: باسی جوانی مانگ وهەموو جوانییێ دەکەین، کە ناهەمواریی ئەم ژیانە هەمووی لە پێشچاو ونکردووین، وایلێکردووین، خۆمانی لێگێلکەین.
ئەمیرە: گەر بگەیشتنایە هەندەران، ژیانتان خۆشدەبوو، بە ویستی خۆتان باوەشتان بۆ جوانی و خۆشییەکان دەکردەوە.
گوتم: ڕاستە، بەڵام نێوچەوانی ئێمە نەیهێنا.
بە دەمەتەقێوە کاتێ زۆرمان بردەسەر، سەرنشینەکان نووستبوون، تەنیا هەر چوارمان نەبێ.گوتم با چاومان گەرمکەین.
سەرم نایە لای جامەکەوە، دەمویست بنووم، ئەوانیش خۆیان خەریك کرد بە نووستنێکی درۆزنەوە.
پاش نیوکاتژمێر، هەرخەو نەدەهاتە چاوم، (ئەمیرە)ی تەنیشتم، جوڵەیەکی کرد وخۆی لێم نزیك کردەوە، پترخۆم نووسانە جامەکەوە، کەمێکی پێچوو، تەواو نزیکبووەوە، قۆڵە سپی و

نەرمەکەی لە قۆڵم توندکردبوو، بە ئێسکی قۆڵم گەیشتبوو، بەڵام ئەو پەری ئاسا نەرمییەکەی بێکۆتا بوو.

خەو مالاوایی لێکردبووین، گوێم لە لێدانی دڵم بوو، چاوەکان خەوی تێدا زڕابوو، جاروبار حەزم دەکرد بگەینە پایتەخت و کۆتایی بەم کەشە ڕۆمانسییەبێ، جاروبار پەشیماندەبوومەوە، بگرە لێشاوێ پەشیمانیی ڕووی تێدەکردم.بە خۆم دەگوت بۆ حەزدەکەی، تۆ ئێستە لەوپەڕی بەختەوەری دای و شۆخێ میوانتە، خەون نییە و ڕاستییە، شانی بە شانتەوەیە، خۆی پێشکەش کردووی، هێشتا تۆ ناڕازیت؟!تەماشای وریام کرد، دڵنیابووم نەخەوتبوو وخۆی کردبووە خەو، شانی ببووە سەرینی ڕوومەتە نەرمەکەی سەمیرە. هەموو نوستبوون، ئێمەش بە هێمنی خۆمان لە یەکدی نزیك کردبووەوە، هەستەوەرەکان نەدەحەسانەوە وبەو شەوە درەنگە ئوقرەیان لێبڕابوو، ئەمیرە بە تەواوی خاو ببووەوە، نەمدەزانی بە ڕاستی نوستبوو یا هەر وەك من بوو، دوودڵی کردم، پتر دوودڵ بووم کە شانم ببووە سەرین وبە ئاسپایی خەرمانێ لە قژە ئاوریشمیەکەی بلاوببوونەوە سەر سینگ وقۆڵم، پشتم تەواو نوسان بە کورسییەکەوە، بە جارێ قژە خاوەکە خزییە سەر سینگم، ڕوومەتی نەرمی کەوتە سەر دڵم، لێدانی دڵم بووە لانکێ بۆ ڕاژەنینی، مێشکم لە پشوودانا بوو، قۆڵی چەپم، خستە سەر کورسییەکەی پشتی، هێدی هێدی قۆڵم خاوبووەوە و کەوتە سەر ملی، دەستم خستە نێو ئەو قژەی کە بە

سەر قۆڵی پەرش و بڵاوببوونەوە، پەنجەکانم دابەشبوون بە سەر قۆڵی نەرمیی، بە شەرمەوە خۆیان لە قۆڵ و باسکی مەرمەڕیدا دەسوو، ئەویش خەوە دڕۆزنەکەی خۆشتر دەکرد.
چاوەکانم بە ئارامی نوقانبوو، بە هێمنی هەستم لەگەڵ هەست ونەستی تێکەڵ ببوو، ئەمجارەیان دەستی ڕاستم گەیانە دەسەکەی دیکەی، پەنجەکانم تێکەڵ پەنجەکانی کرد، جوڵەیەکی کرد، بەڵام چاوەکانی نەکردەوە، دڵم نەدەهات پەنجەکانی بگوشم، ئەو جوڵەیەکی بە پەنجەکانی کرد، لێشاوێ تامەزرۆیی پێبەخشیم، پەنجەکانم لە خۆشی ولە شەرمان دەلەرزین، بە هێمنی و بە دڵی خۆم دەسیم گوشی، کانیاوی لە چاو ودڵودەروون و مێشکم هەڵقوڵان، پەنجەکانی دەسەکەی دی لە نێو لۆکەیەکی ئاوریشم داپۆشراو بوو، لە سەر ئاوازێکی گۆرانی خاو دەجوڵانەوە، چاوم زۆر بە ئارامی کردەوە، ئەو مانگەی کە دەسم لێگیر نابوو، وا ئێستە لە سەر دڵمایە، باشترچاوم کردەوە، دوو مەمی سپی تونند وەك بەرد، دوو گۆی سوور وەك گوڵی تازە پشکووتوو وابوون، دۆڵێ پرشنگداریان دروسکردبوو، هێند کاریبوو، ئاوی لە چاو دەرهێنام، ئەمجارەیان ئەو چاوە مەستەکانی کردەوە، زەردەخەنەییێکی بۆ کردم، بێشەرمکردن، ڕوومەتی ئاڵونەرمی، لە سەر دڵم لا نەبرد، بە خەندەی جوان وپاکوبێگەردی، لێوەکانی جودا ببوونەوە، دەمویست بۆشاییەکەیان پڕکەمەوە، بەڵام نەمدەوێرا، سەیری ڕوومەتەکانیم کرد، مانگبوون، حەزمدەکرد

هەناسەم بکەمە خەرمان لە دەوری ئەو مانگەدا، بەڵام لە دەوروبەر دەترسام، بەهاریٚ بوو لە جەستەمدا، کانیاویٚ زۆر هەڵدەقوڵا، خۆزگەم دەخواست، (ژیان وەك سواربوونی ئەم شەمەندەفەرە بوایە، تەنیا خۆشەویستیی ئاڵوگۆڕکردن ودامرکانەوەی تامەزرۆی ئارەزووەکان بوایە، پاشان، لە وێستگەییٚ دابەزینایە، کۆتایی بە ژیان بهاتایە).

نەمدەوێرا پتر تەماشایکەم، یا پەنجەکانم بە ئاستەم بجوڵێنم، دەترسام ئەمجارەیان تووشی هەڵەیەکی گەورەترم بکا، هەر لەبەرئەوە لە جامەکەوە دەمڕوانییە دەرەوە، تا خەیاڵی دڵتەزێن وناخۆش دروستکەمەوە، بەڵام هێزیٚ لەو خەیاڵە بە تواناتر، زاڵ ببوو، بە زۆر ئاوڕی پێدامەوە، ئاشنای کردمەوە، لە سەرنجدانی باخی بەی و لە بۆنکردنی گوڵ وئاوریشم، لە دەسوەردانی قژی خاو، جووت گۆی بەی، ناخۆشییەکانی لە بیرم دەبردەوە وداگیری دەکردمەوە.بۆم دەرکەوت، مێینە زۆر بە هێزە، دەتوانیٚ پاڵەوان لە خشتە بەریٚ، مێشکی زانا ئاڵۆز بکات، کەسێتی بەرز لە خشتە ببا و ڕیسوای بکا بڕوام نەبوو وابیٚ، بەڵام کە بیرم لە خۆمکردەوە، لە خشتە براوم، (نازە)ی خۆشەویستی لە بیربردمەوە، دانی پێنام کە هەموو تواناکان بەرانبەری، تووشی ئیفلیج دەبن.

بەرەبەیان نزیکبووەوە، مانگ، تیشکی نەما، جوڵەیەکم بۆ کرد، ئەمیرە، پتر خۆی نوسانە سینگمەوە، چرپانمە بنگوێی گوتم خەریکە ڕۆژ دەبێتەوە وسەرنشینەکان بە ئاگادێن، با بەم شێوەیە

نەمانبینن.تەماشای وریا و سەمیرەم کرد، بە تەواوی تێکەڵی یەکدیببوون، نووکی پێم گەیاندە نووکی پێی وریا، چاوی هەڵبڕی، لە خەوە درۆزنەکەیم کرد.
نزیك پایتەخت بووینەوە، ئەمیرە بە دەنگیٚ ناسك گوتی :
دەچینەوە بۆ ماڵی ئێمە، جوانترین وخۆشترین خانوومان لە پایتەخت هەیە وتەنیا ئەم باوکە پیرەمان لەگەڵدایە دوو برامان لە هەندەرانن.
گوتم: سوپاستاندەکەین، دەبیٚ بڕۆینەوە، ئێستە کەسوکار و ژنومنداڵەکانمان لە چاوەڕوانیدان.
ئەمیرە دەمی نایە بن گوێی سەمیرە، فسکە فسکیانبوو.پاشان سەمیرە گوتی :
گەر ئێوە بتانەویٚ لە هەژاریی وناخۆشیی ئەم ژیانە ڕزگاربن، پێشنیازێکم هەیە.
گوتم :هەر چیی بڵێی ئامادەین، تەنیا لە نەداری ڕزگارمان بکات.
تەماشایی ئەمیرەی کرد، ڕووی تێکردینەوە، کوڵمەکانی سوور هەڵگەڕان، بە ناز و شەرمەوە، گوتی:
گەر ئێوە ڕازی بن، هەر دووکمان شووتان پێدەکەین.
هەواڵێکی کتوپڕ بوو، حەپەساین و بێدەنگی کردین، ئەمیرە گوتی زۆر کەس دێن بۆ داخوازی، ئێمە بە هەموو کەس ڕازی نابین، بەڵام ئێوە چوونەتە دڵمانەوە، گەر ڕازیبن لە قازانجتانە، دڵنیابن نایەڵین خێزانتان بزانن و زۆر بە نهێنیی دەبیٚ.

سەرمانسوڕمابوو، دەبێ ئەم قسانە بە ڕاستی بکەن! ئایا لەگەڵ ئێمەیانە؟

– سامان چیی دەڵێی، ڕازی دەبیت، یا ڕازی نابیت؟

– ئەوە پرسیاری ناوێ، چۆن ڕازی دەبین!!.

– زۆر بە نهێنی دەیانهێنین ولە پایتەخت دادەنشین، لە هەژاری ڕزگاردەبین.

ئەمیرە: زمانتان تێناگەین ، بڕیاری چییتاندا ؟

گوتم :هەرگیز ناتوانین، سەرەڕای هەموو دەردەسەریێ، ژنیان بە سەر بێنین وسپڵەیی و بێوەفایی بەرانبەریان بنوێنین!. بێدەنگبوون، کەمێ زویربوونی خۆیان پیشاندابن، هێندەی نەمابوو بگرییێن، بە چاوی مەست و پڕ لە ئەشکییەوە، تەماشای کردین، بە گلەیی و گازەندەوە،زمانی بووەوە، سەمیرە گوتی:

تا ئێستە کچتان بینیووە، خودی خۆی یەخەی کوڕ بگرێ شووت پێدەکەم؟!، نەیتوانی پتر بدوێ، بە دەستی ناسك ولەرزۆکی، لە نێو جانتەکەی کلینسی دەرهێنا، ئەشکە نازی چاوەکانی پێسرییەوە.

پەشیمانبووم لەو چەند کاتژمێرەی هەستونەست وخۆشەویستیم لەگەڵ ئەمیرە گۆڕیبووەوە، خۆم بە تاوانباردەزانی، هەستی ناسکی پەریێ کە خۆی پێشکەشکردووم بشکێنم.

بەو بێدەنگییە ماینەوە تا گەیشتینە نێو پایتەخت، زانیان ڕازی نابین.سەمیرە گوتی دەتوانن ئێستە بڕیار نەدەن، پێنووس

وپەڕاوێکی دەرهێنا لە جانتاکەی وناونیشانی خۆیانی نووسی ودایە دەست وریا وگوتی: بیری لێبکەنەوە، بەم ژمارەیە تەلەفۆنمان بۆ بکەن.

– بیری لێدەکەینەوە و پێوەندییتان پێوە دەکەین.

ئەمیرە ڕووی تێکردم وگوتی باشە سامان.دڵیم بۆ نەشکا، گوتم بە چاوان.

گەیشتینە نێو وێستگەکە، دابەزین وچووینە نێو گۆڕەپانی وێسگەکە، دوا وشە، بە نێو دوو لێوی ئاڵ وناسکیان (بیرتان نەچێ، پێوەندیی بکەن)، مالاّوابوونمان لێکردن.

ئەوان لە چاوەڕوانییبوون، لە سوچێکی گۆڕەپانەکەوە تەماشایان دەکردین، کە لێیان نزیکبووینەوە، فایەق بە تووڕەییەوە گوتی ئەمە ئیشە بە ئێمەتان کرد؟

گوتم : کاکە بێڵن جارێ سلاّو بکەین.

وریا: ئێ چیی بکەین، ئێمە ویستمان بە پێوە نەبن.

ئەحمەد: بەخێر بێنەوە، کەس نازانێ خێر لە چییدایە.

باوکی وریا: قسەی کاکە (ئەحمەد)ە.

ئاوڕمان لە کچەکان دایەوە ودەستیان بەرزکردەوەو ڕایانوەشاند.

فایەق :بە ڕاستی خێری تێدا بووە، ئەی نەتانبینیوە چۆن ئەو کچە جوانانە سلاّویان بۆ دەکەن.

وریا: چیی بکەین، لە نێو شەمەندەفەرەکە بوونە هاوڕێمان.

ئەحمەد: ئەوەش دەبێ.

باوکی وریا تۆزێ بە توڕەبوونەوە گوتی بچن بلیت ببڕن.
کاتــژمێرێ دوای بلیــت بڕینەکــە، لــە بڵنــدگۆ بانگــەوازی کــرد شـەمەندۆفێرەکە دەردەچـێ.ئەمجارەیان لای ئەحمـەد دانیشـتم، بـە دەمەتەقێوە، کاتێ زۆرمان بە سەر برد.
تەماشــــای دەرەوەم دەکـــرد، خــــەیاڵی نـــاخۆش ڕاپێچـــیکردم ولەبەرخۆمەوە ئەدوام وئەمگوت ئێستا ڕوو لە کوێ بکەم، پەنا بۆ کـێ بـەرم، خـۆ مـن ئێسـتە خـاوەنی هـیچ نـیم، تـەزووی ناخۆشـی سەراپای جەستەی گرتمـەوە، سڕیکردم، بیری ئاڵۆزانم، ماوەیـێ بێـدەنگی کـردم، ئومێـدی بینینـەوەی کەسـەکانم، ئـامێزی دایکـم ، نازەو جگەر گۆشەکانم، کەمێ لە ئازارەکانیان دەرەوانمەوە.
(ئەمیرە لە دوورەوە، بە خەندەیێ بێوێنە، بە بـەرگێ ئاوریشـمی لـە چەشنی پەری، باوەشی کردبووەوە وبانگی دەکردم، جوانییەکەی کاری تێکردم و ویستم بە پەلە پێی بگـەم، لـە پڕ، نـازە بـە بـەرگی بووکێنییەوە دەرکەوت، کێبڕکێی جوانیی ئـەمیرەی دەکـرد، گلـەیی بێوەفایی لێدەکردم).
داوی خــەیاڵم پســاو ســەرم داخســت، ئــەو ئەندێشــەیە، ناپــاکی بەرانبەر نازەی پێگـوتم ودڵـی پڕکـردم، چـەند دڵـۆپێ لـە ئەسرینـی پێڕشتم.بە هۆی تێکچوونی شەمەندەفەرکەوە شەومان بەسەرهات.
تەماشــام کــرد زۆربــەی سەرنشــینەکان نووســتبوون، تەماشــای (ئەحمــەد)م کــرد، نووســتبوو، ویســتم بنــووم، بــەڵام نــەمتوانی و بێسوود بوو. دیسانەوە، لـە جامەکـەوە تەماشـایێ دەرەوەم کـرد،

ئەمجارەیان گڕی ئاگری نەوتی شارەکەمان، ڕەنگێ سوریی دابووە ئەو دەڤەرە، هیوا و ئاسۆی بڵندی گەلەکەمانیی نیشاندەدا، کە هەر دەبێ کورد بەو ئاواتە بگات و تەنیا خزمەتی خاك و نیشتمانی خۆی بکات.

گەیشتینە وێستگە ودابەزین، سواری تاکسی بووین، لە سەر ئەو شەقامە دابەزیم، کە نزیك ماڵی برا و خەزوورم بوو.

ناخۆشترین هەواڵیان پێڕاگەیاندم کە دایکم بەرگەی هەواڵی گرتنمانی نەگرتبوو گیانی پاکی سپاردبوو، نازی هاوسەرم وسۆز وڕۆز بە هۆی لێپرسراوانی ڕژێم بێزارکردنیان بە پرسیار ولێپرسینەوە بەرەو هەولێری پایتەخت چوونە و دەبێت واز لە ژیانی کەرکوك بێنم ولەوێدا دەست بە ژیان بکەینەوە.

# گۆڕستان

بەری بەیان بوو ، پێش ئەوەی شارەکەم دیسانەوە جێبێڵم، چوومە سەر گۆڕەکەی دایکم، نزیك گۆڕستانەکە بووینەوە، "کوڕەکەم جێم مەهێڵە، تەمەنی پیرە مەڕێکم ماوە، لە پاش ئێوە دەمرم"لە گوێمدا دەزرینگایەوە، ئەو دەنگە ، هێزی ئەژنۆی شکانم، هەر کە گەیشتینە سەر گۆڕی پیرۆزی، باوەشم لە کێلەکەیدا و ماچم کرد، ماوەیێ نێو چەوانم بە کێلەکەوە نا، هەر دڵۆپێکی فرمیسکم، یادەوەرییێکی ڕۆژانی تاڵوشیرینی لە خۆگرتبوو ودەبارییە سەر کێل و گڵە سوورەکەی سەر گۆڕی دایکم، باوەشم لە خۆڵی سەر گۆڕەکەیدا، بۆنی خۆڵە سوورەکە بۆنی ئامێزی دایکمی لێدەهات، حەزمدەکرد تێر ئەو بۆنە بم، بەڵام گرتی بە قۆڵمدا وهەڵیساندم، وتی دایکمان لە ئازارێکی زۆردا بوو، چەند بمایەتەوە خراپتر ڕەزیلی سەر جێگە دەبوو، ئەو ڕۆیشت، ئێمەش دەیگەینێ، ژیان هەروا بووە و وا دەبێ، بە دەستی من و تۆ نییە.وا درەنگیکرد، با بچینە گەراج، تا خۆت بگەیەنیتە منداڵەکان. کێلەکەم ماچکردەوە، کەمێك لە خۆڵی سووری سەر گۆڕەکەیم خستە گیرفانم ومالآواییم لێکرد.هەر کە

گەیشتینە سەر شەقام، وا ڕێککەوت، هاوڕێیەکی دێرینم بەرەو هەولێر دەچوو، وەستا، سواربووم وبە هۆیەوە بە ئاسانی لە زاڵگەی ڕژێم ڕزگاربووم، چووینە پایتەختی کوردستان.

## ئۆردوگا

نزيك نيوەڕۆ گەيشتم، خەڵكی ئۆردوگا، گوندنشينەكانی سنووری كەركوك بوون، ڕژێمی ديكتاتۆر، گوندەكانی ڕوخاندن و ئۆردوگای لە دەرەوەی كەركوك بۆ دروستكردن، بەم ئۆردوگا زۆرەملێيانە، سەرچاوەی داهاتی كشتوكاڵيی وئاژەڵداريی لە دەستدان، سيمای هەژاريی و نەداريی وماندووبوون بە ڕوخسارييانەوە دياربوو، منيش دەبێ بە ناچاری لەم ئۆردوگايە بژيم، هاوبەشی خەموپەژارە و مەينەتييان بم.

ئاهێكی سەردم هەڵكێشا، كە خۆم خستە گێژاوێ ديكەوە، ئاخۆ ئەمجارە بەرەو كوێ ڕاپێچمان دەكات، تووشی چ نەگبەتيێ ديكەمان دەكات. بە زوويی خۆم دامەزراند بە پيشەی مامۆستايی، لەگەڵ ئەوەی كە ژيانی مامۆستا لەوپەڕی هەژاريی وناخۆشيدابوو، بەڵام من جگە لە مامۆستايی لەگەڵ دوكانێ بازرگانی پێڵاو فرۆتن ڕێككەوتم تا پێڵاو وەرگرم، لە پاش فرۆشتنی، پارەكەی بۆ ببەمەوە و قازانجی خۆم وەرگرم. بەم شێوەيە بووم بە مامۆستا، لە دوای دەوام دەچوومە نێو شار (پێڵاو)ی پياوانم وەردەگرت ولە سەر شەقام و شۆستەكان دەمفرۆشت، دەبوايە ئازا بوويتايە، نەوەك

پـۆلیس بتگـریٚ و بـه کالاکانتـەوه بتبـا بـۆ زینـدانی، بـه ناچـاری چاوشارکێت لەگەڵ پۆلیس دەکرد، به وریاییەوەش مامەڵەت لەگەڵ کڕیاردەکرد.
هەندیٚ جار، دەبوایه ئاگاداری گوللەی ویٚڵ بوویتایه، که له پڕێکدا دوو حیـزب لـه نێـو بازاڕ بەرانبـەریان لـه یەکدی دەگـرت ودەبـوو بـه شەڕیان، جا گەر بەر گوللەییٚ ویٚڵ بکەوتیایەی به فیڕۆ دەڕۆیشـتی.
بـه ڕاسـتی ژیـانیٚ سـەختبوو، دەبوایـه( نانـت لـه گـەرووی شـێرو نەهەنگ دەربێنایه).کاتەکانم دابەشکردبوو، بۆ مامۆستایی و پێڵاو فرۆشتن، تەنانەت، لەوانه وتنەوەدا بیرم لای ئەوه بوو، کـەی وانەکـه تەواو دەبیٚ و دەچمه بازاڕ و جووتـی پێڵاو زیاتر دەفرۆشم.
جگه لەم هەموو ناخۆشی و گرانییه "مووچەی مامۆستا چەند مانگ جاریٚ دەدرا"وێڕای پیرۆزی نـاو و پیشـەی مامۆسـتایی کـه پشـووی هـاوین دەهـات، تۆماری ژمێریـاریی بـۆ مووچـەی مانگانـه، دەکرایـه دۆلابەوه و کلیلی لێدەدرا، کاتی کردنـەوەی قوتابخانـه دەهاتینـەوه یادیان.پاش دوو مانگ مووچەیەکیان پێدام، ئەویش بۆ کریٚ خانوو و قەرزی ئەو دوکاندارەی که خواردنی ڕۆژانەمان لای دەهێنا.
کـاتی سـەرما وسـۆڵه وسـەختی زسـتان، سـووتەمەنی نـەبوو، گـەر هەبوایـه زۆر گرانبـوو، خـەڵکی هـەر لـه ئێوارێـوه خۆیـان دەخسـته ژێـر پـەتوو و لێفـەکانیان، هێنـد دەیانهێنـا ودەیـانبردن تـا گـەرم ببنەوه پێخەفەکان تەواو شڕببوون.

لـەو ڕۆژەدا باشـترین سـووتەمەنی خـەڵکی، هەڵکەنـدنی قـیری شـەقامەکان بـوو، دەیانهێنایـەوە و ماڵـەوەیان پێگەرمـدەکردەوە، دووکەڵەکەشـی گوێـو لـووت و قـوڕگی دەگـرت و ڕوخسـاری ڕەش دەکردی.

لە نێو شار، هەر لە دوورەوە دەناسرایتەوە کە خەڵکی ئۆردوگـای. ژیـانیٚ کولەمـەرگیی بـاڵی کێشـابووە سـەرمان، سـۆز و ڕۆز و دایکیان، زۆر بێهیوا ببوون، خۆم لەوان خراپتر.

ڕۆژێکیـان هـەواڵم پێگەیشـت، وریـا وڕێبـوار لـە ئـەمن بەنـدکراون، ئێستا لە ژێر دەستی جەللادەکانی ڕژێمدان؟!

بە ماڵەوەم نەگوت تا خـەم نـەخۆن، بەڵام ئـەو شـەوە خـەوم نـەبوو، ئازارو ئەشکەنجەدانی وریا بـە (کارەبا، هەڵواسین، فەلاقە کـردن). دەهاتە پێشچاوم.

# پێڵاو فرۆشتن

هــەینی، هــەتاوێكی خۆشــبوو، لــە بــازاڕێكی جــەنجاڵ، پارچــە گونییەكەم لە سەر شۆستەكە ڕاخست وپێڵاوم لـە سەری ڕیزكـرد، دەسـتمكرد بـە بـانگكردن، دەنگم بەرزدەكرد، شـەرمم بـە تـەواوی شـكابوو. قوتـابییێ خـۆم بینی لەگـەڵ دایكـی هـاتبوون بـۆ شـار و هێدی هێدی نزیك دەبوونەوە، بێدەنگی كردم، وازم لـە بـانگ كـردن هێنا، خۆم بە ڕێكخستنی پێڵاوەكانەوە خەریك كـرد، هەسـتم لایـان بـوو، دایكـی وەسـتا وسـەیری پـێڵاوی دەكـرد، سـەرم داخسـتبوو، قوتابییەكە گوتی مامۆستاچۆنی؟

بـە ناچـاری سـەرم هـەڵبڕی، ئـارەقی پێكـردم گـوتم باشـم كوڕەكـەم. ڕووی كـردە دایكـی وگـوتی دایـە گیـان، ئەمـە مامۆستا(سـامان)ە ومامۆستای ئینگلیزییمانە، توخوا با پێڵاوی لێبكڕین.

زۆرم پێناخۆشــبوو، وامــدەزانی خێــرم پێدەكــەن.دایكی گــوتی مامۆستا چۆنی، ئەی (ئاكۆ)ی كوڕم لەوانەكەی تۆ دەبێ چۆن بـێ؟

گوتم: سوپاستەكەم، سەبارەت بە (ئاكۆ)ش، زۆر باشە.

گوتی: وابێ جوتێ پێڵاوم بدەرێ.

گوتم :گەر پێویستتان نییە بۆ دەیكڕن؟

گوتی: باوکی ئاکۆ پێویستییە بۆیە دەیکڕم.
جووتێکی هەڵگرت وپارەکەی پێدام، گوتی مامۆستا، ماوەکەم بۆ مەگەڕێنەوە، نامەوێ، بەڵام هەر بە زۆر بۆم گەڕاندنەوە، تا لە کۆڵم بوونەوە، ڕەنگی ڕوخسارم، بە چەندین شێوە دەگۆڕا؛ بەو سەرمایە ئارەقی پێکردم.سەرێکم لە حاڵی خۆم بادا وگوتم لەمەولا، پێمدەڵێن، مامۆستا (پێڵاو فرۆشەکە).
هەر چۆنێ بوو ئەو دیمەنەم لە بیر خۆم بردەوە ودەسمکردەوە بە بانگکردن، بەڵام زۆر بە وریاییەوە بانگم دەکرد، جاروبار سەیری دوورم دەکرد، نەوەك قوتابی دیکەم لێ پەیدا بێت.
نزیك عەسر بوو، ئەمجارەیان لە دوورەوە یەکێکم بینی، کە زۆر وردبوومەوە باوەڕم نەدەکرد، ئەو ئاگادار نەبوو، کەوتبووە دەریای خەیاڵەوە، کە نزیکبووەوە، گوتم:
وریا گیان ئەوە تۆی، بۆ کوێ دەچیی؟!
حەپەسا وقسەی بۆ نەدەکرا، تەنیا ئەوەندەی بۆ کرا، باوەشێکی لێدام، بە سەرسوڕماوییەوە تەماشای یەکدیمان دەکرد، کە سەیری پێڵاوەکانی کرد، گوتی سامان گیان، دەبێ ئێمە هەر وا بژین؟!
بەڵام شایانی ئەوەین کە وا بژین، باشترین هەلت لە دەستی من وخۆتدا، گەر (سەمیرە و ئەمیرە)مان بهێنایە، ئێستە لە بەغدا بووین، کەسیش ناومانی نەدەهێنا، ژن و منداڵی ئێرەمانش بە جوانی

بەخێو دەكرا.
گوتم: كاتی ئەو قسانە نییە، من لەو ڕۆژەوەی كە زانیم بەندكراوی، دڵم هەرلەلات بووە و شەوانە لەگەڵتدا لە كونە تاریكەكانی بەندیخانە بووم، هەر ئێستە پێلاوەكان دەكەینە گونییەكەوە، دەیبەینەوە بۆ دوكاندارەكە و قازانجی ئەوڕۆ وەردەگرم، پێشئەوەی بچینەوە بۆ ماڵ دەچین بۆ چایخانەی (مەچكۆ)، دوو چا دەخۆین، پاشان چۆن بەندكرای وچۆن ئازاد بووی، هەمووم بۆ باسدەكەی.
كارەكەمان ئەنجامدا وچووینە چایخانەكە، گوتم ئێستە باسی بەسەرهاتەكەتم بۆ بكە، ئێرەش چایخانەی نێو ڕژێم نییە بترسین و قسە نەكەین ولە سێبەری خۆمان سڵكەینەوە.
گوتی: سامان گیان، باسی چییت بۆ بكەم، گەر لەشم ببینی هەموو شوێنی كێبڵ و ئوتووە، وا ترساوم لە ڕژێم وجەللادەكانی هەر كە هاتمە شاری هەولێرەوە، چەند چەكداریٚ خۆمانم بینی، سەرەتا زۆر ترسام، وامدەزانی نێو ڕژێمە وهەر ئێستە داوای ناسنامەم لێدەكەن و بیانوویٚ دەگرن و پەلبەستم دەكەن.خۆزگە وەك تۆ دەهاتم بۆ ئێرە و ئازاد دەبووم.
گوتم: بەڵیٚ ئێرە ئازادییە، بەڵام گرانییە.
گوتی:با باسی خۆم بكەم، چییم بە سەرهاتووە، ئەوسا ئەم شوێنەت لێدەبێت بە بەهەشت.

گــوتم :فــەرموو، باســـەکەت بکـــە.گوتی:بـــە ئـــارەزووی خـــۆم دەسمکردەوە کارکردن، کەس پرسیاری لێنەدەکردم، ترسم لە ڕژێم نەمابوو، بێخەم بووم، شەوێ لە نیوەشەو، بە توندی لە دەرگا درا، دڵم زۆر ترسا، دوودڵ بووم لە کردنەوەی دەرگاکە، ناچاربووم و بە ترســەوە دەرگاکــەم کــردەوە، کــە ســەیری دەرەوەم کــرد، چــەند چــەکدارێ لــە پــێش دەرگاکــە وەســتابوون، یــەکیان گــوتی نــاوت چییە؟گوتم وریا. گوتی فەرموو لەگەڵمان وەرە، پێنج خولەکێ کارمان پێتە.گوتم باشە با بچم خۆم بگۆڕم، دوانیـان پەلاماریانـدام، گرتیـــان بـــە قۆڵمـــدا، بـــەرەو ئۆتۆمبیلەکـــە ڕاپێچـــیان کـــردم، زۆرپێمگـوتن بـێڵن بـە ماڵـەوە بڵـێم، بـەڵام بێسـوودبوو، هـەموو سواربوون، (چرۆ) هاتە پێش دەرگا وهاواریکرد مێردەکەم بۆ کوێ دەبەن؟!

ڕووی لوولـەی تفـەنگیان لـە (چـرۆ) کـرد، گوتیـان بـە پەلـە بچـۆرە ژوورەوە.هەر لە نێو لاندکرۆزەکە، چاویان بەستم وسەریان خستمە نێوان هەر دوو لاقم، کە دەمگوت بۆ کـوێم دەبـەن، دەیانکێشا بە سـەرمدا.دەمزانی لـە گـەڕەك دوورخراومەتـەوە، بـە نێـو شـاردا دەڕۆیشـتین، زۆربـەی شـوێنەکانم دەزانـی.لـە شـوێنێکدا وەسـتا.بە پەلـە دایـان بـەزانم، دوو کـەس گرتیـان بـە قۆڵمـدا ودەرگایـەکیان کردەوە، کە چاویان کردمەوە لە ژوورێ بووم، بە کورسـی و مێـزی ژوورەکە زانیم ئەمە فەرمانگەیە.یەکێ پرسیاری لێکردم، گـوتی تـۆ (وریا)ی.گوتم بەڵێ منم.بە سەری هێمای بۆ کردن، گرتیانـەوە بە

قۆڵمـدا، ویسـتم سـەیریٚ چـوار دەوری خـۆم بکـەم تـا بـزانم ئێـرە کوێیە، لە ناکاو زللەیەکیان لێدام، گوێیـان تـەزانم، گوتیان سـەرت دابخە. دەرگاییٚ دیکەیان کردەوە، لەبەر تاریکی هیچم نـەدەبینی، ئینجا زانـیم ئێـرە کونـە تاریکـەکانی ڕژێمـە، ئەمـە ئـەو شـوێنەیە زۆرجار لێیدەترسام ولە شیرینی خەودا ڕایدەچڵەکانم.

بە پەیژەیەکدا بەرەو خـوارەوە چـووین، (دە) پایـەم ئـەژماردە کـرد، گەیشتینە خواری خوارەوە، بردیانمە ژوورێکەوە، بیٚ لێپرسینەوە، بە کێبلٚ دەسیانکرد بە لێدانم، بەرچاوم تەواوکرابووەوە، ئەفسەریٚ هاتە ژوورەوە، ڕووی لـە جـەللادەکان کـرد وگـوتی لێیمـەدەن، ئەمـە کوڕێکی باشە ئێستە هەموو نهێنی زانیاریی حیزبەکەی دەلیٚ و نـە ئێمە ماندوو دەکات نەخۆیشی تووشی ئازاردان دەکات.

ڕووی تێکـردم و گـوتی کـوڕی بـاش، بـیٚ پێچوپەنا، پێمـانبلیٚ لـە حیزبەکەت، کێی دیکەت لەگەڵدایە؟

گـوتم:هیچـتان لـیٚ تێناگـەم، هـیچ نـازانم، دڵنیـام منتـان بـە هەڵـە گرتووە، من لە هیچ حیزبێکدا کار ناکەم.

گوتی:گەر بە قسەم دەکەی، دان بـە زانیارییـەکان دەنێـی وخـۆت لـە ئازاردان بە دوور دەگری.

گــوتم:هــیچ نــازانم، ئەمــەی ئێــوە دەیلــێن بەخــەیاڵیش بــیرم لێنەکردوەتەوە.لەگەڵ لێدانی زللەیەکدا وڕی کردم و گوتی خۆت لە هـیچ شـت هەڵـە مەکـە، ئێمـە هـەموو دەزانـین لـەحیزبیٚ ئیسـلامی کاردەکـەی بـۆ بەرژەوەنـدیی حیزبەکـەتیش تـا (وڵاتـی سـعودی)

چوویته.هەر کە گوتم  شتی وانییە.کەوتنە لێدانم بە شەق و زللە و کێبلّ، زۆریان لێدام، پەکیان خستم.
ئەفسەرەکە هاتە نزیکمەوە وگوتی بیلّێ تا لەم ئازارە ڕزگاربیت. لەبەر ئازار وەلآمم بۆ نەدەدرایەوە.پتر خۆی لێنزیککردمەوە، گوتی دان بنێ بەو حیزبەدا، چونکە ئێمە هەموو شت دەزانین.بە سەر لەقاندن، وەلآمی (نا )م پێگوت.
ئەمجارەیان لە سەر کورسیێ دایاننام، جەمسەری کارەبایان لە پەنجەی دەستم گیرکرد وکارەباکەیان پێکرد، هەموو گیانم کەوتە لەرزین ولەرەلەر، لێدانی دلّم زیادی کرد، هەناسەم تەنگبوو، قوڕگم خەریکبوو بتەقێ، هاواریێ زۆرم کرد، تەزوەکەیان بڕی وپرسیاریان لێکردمەوە، تا دان بەوەدا بنێم سەر بە حیزبێ ئیسلامیم. هەر دەمگوت من بە هەلّە گیراوم.
جەمسەری کارەبایان گواستەوە بۆ پەنجەکانی پێم، بەلآم هەر دانم پێدا نەهێنا، بە ویستی خۆیان کارەبایان لێدەدام، تا بێهۆشیان کردم.کە بە هۆشی خۆم هاتمەوە، کوڕێ بە کوردی بانگیکردم، تەنیا خۆم و ئەو کوڕە لەو ژوورەدا بووین، کە مەترێ چوار گۆشە دەبوو. ئەو کوڕە ناوی ئازاد بوو، زۆر ورەی بەرزکردمەوە، گوتی نەکەی دان بە هیچ شتێ بنێی، چەندجارێ دیکە ئازار دەدرێی وئیدی وازت لێدێنن.گوتم دان بە چییدا بنێم، من هیچم نەکردووە.گوتی گەر شتێکیان بۆ دروستکردی ولە ئازاردا دانت

پێدانا ئیدی لای ئەوان هەموو شتێکی، گەر نا، ئەوا بە ئاسانی لە دادگا ڕزگار دەبی.

بۆ ڕۆژی دووەم، دەرگاکەیان کردەوە، بە شەق و کێبڵ بەرەو ژووری ئازاردان بردیانم. ئەفسەرەکە گوتی پێشئەوەی ئازاربدرێی وا چاکە دان بە ئەندامانی حیزبەکەت بێنی.

گوتم: دڵنیابە من هیچ نیم، ئیدی چییت وەڵام بدەمەوە.

دەسیان کردەوە بە لێدانم، پاشان بە دووانەوە خستیانمە سەر مێزێ، لە مەچەکەوە دەستیان لە پشتەوە بە گوریسێکی هەڵواسراوەوە بەستم.

ئەفسەرەکە گوتی (هۆریا) چیی دەڵێی، دانی پیا دەنێی یا ئێستە قۆڵەکانت بشکێنین.بێدەنگ بووم، چەندجارێ پرسیارەکەی دووبارەکردەوە، وەڵامم نەبوو، شەقێکیان لە مێزەکەی ژێر پێدام، زۆر ئازاریدام، وامدەزانی هەر دوو قۆڵم دەرچووە، کەمێ بێهۆش کەوتم، ئاوێکی ساردیان پێداکردم، بە هۆشی خۆم هاتمەوە. پرسیاری لێکردمەوە، هەر بێدەنگبووم، گوریسەکەیان لێکردمەوە کەوتمە سەر زەوی، پاشان بردیانمە سەر کورسیێ، لەبەر ئازار نەمدەتوانی دانیشم، یەکیان لە پشتەوە گرتمی.ئەفسەرەکە وتی ئێستە دوا کاتی ژیانتە، بۆ دان بە تاوانەکانت ناهێنی؟تۆ خاوەن ماڵ ومنداڵی، بۆ منداڵت بە هەتیوی.گەورەبن، دڵنیابە ئەمجارەیان تەزووی کارەبات لێدەدەین تا گیانت دەردەچێ و لاشەکەت فڕێ دەدەینە پێش دەمی سەگەکان.

گوتم: دان به چییدا بنێم؟

گوتی: که چوویت بۆ سعودیه، کێت لەگەڵ بوو؟

گوتم: ئێمه لەبەر هەژاریی چووین، نەك بۆ حیزبایەتیی.

گوتی: ئێسته پێم دەڵێی کێ لەگەڵدا بوو، یا پێت بێژم شادومان بێنه کۆتایی ژیانته.

گوتم :ڕێبوار محەمەد، کوڕێکی قاچاخچیی بوو، گەیاندینی، لەگەڵ سامان که ئێسته له هەولێره، ئەمه شتێ شاراوه نییه و ئاشکرایه. گوتی :واته سامان ورێبوار ئەندامانی حیزبەکەتن.

گوتم من له هیچ حیزبێکدا نیم، ئەوەی تۆ باسی دەکەی به هەڵەدا چووی ومن نیم.

جەمسەری کارەبای له سەر زەکەرم گیرکرد، تەزووی کارەباکەیان لێدام، هاوارم دەنگی دەدایەوه هێند ئازاریدام، وامدەزانی میزڵدان و گورچیلەم له لەشم جیادەبنەوه، تەزووی کارەباکەیان بڕی و پرسیاریان لێکردمەوه، نوزەیەکم لێوه دەهات، هاواریکرد گوتی چیی دەڵێی؟سەرێکم لەقاند، چەندجارێ دی سەرم لەقاندەوه، که هیچ نیم.جارێ دیکه تەزوویان به گەڕخست ولەو نوزه نوزەشیان خستم.به ئاگا هاتمەوه، له ژووری هاوڕێکەم ڕاکشابووم، هەستم له سەراپای جەستەم ڕاگرت، هەموو گیانم ئازاربوو، شوێنێ نەبوو ئازاری تێدا نەبێ، چەند حارێکی دیکه ئازاریان دامەوه، بەڵام دانم بەوەدا نه نا که له حیزبێ ئیسلامی بم.

گوتم:وریا گیان ئافەرین، ئافەرین توانیت وێڕای ئەو هەموو ئازار وئەشکەنجەدانە، دان بە ویستە گلاْوەکانیان نەهێنی.
گوتی: ناوی (تۆ)مدا، چونکە ماڵت لە هەولێرە.
ناوی (رێبوار)مدا چونکە قاچاخچیی بوو وناوەکەی شاراوە نەبوو.
بەلاْم ناوی (فایەق و ئەحمەد)م نەدا.
گوتم :پاشان چیی ڕوویدا؟
- کاتیّ (رێبوار)یان هێنا، خستیانە ژێر ئەشکەنجە وئازارەوە، پێیان گوتبوو(وریا) دانی بەوەدا هێناوە کە لە (حیزبیّ ئیسلامی) کاردەکەن، ئیدی پتر ئازارمان نەدا وبەرەلاْمان کرد.
ڕێبوار توانای بەرەنگاری ئازارەکانی نەما، بەو قسانە لە خشتەیان برد، دانی بەوەدا هێنا کە لە (حیزبیّ ئیسلامی)یە و زۆر هاتووچۆی ولاْتی سعودیە دەکات.
دادگاییان کردین، پازدە ساڵ بەندکردن بۆ ڕێبوار دەرچوو، بەلاْم من ئازاد کرام.ئێستە کەسوکاری ڕێبوار وازمان لێناهێنن، وا دەزانن من ناوم داوە کە سەر بە حیزبیّ ئیسلامییە، بۆیە باوکم بە باشی زانی تا هەندەران نەوەستم.چاودێری چرۆ و منداڵەکان دەکات، لای خۆی بەخێویان دەکا.ئەم بەیانییە مالاْواییم لێکردن، چونکە لێرە قاچاخچییّ هەیە، گەر سبەینیّ نەڕۆین، دوو سبەی دەڕۆین بەرەو هەندەران.
مەچەکی پیشاندام، کە شوێنی گوریسەکە چۆن مۆری کردبوەوە گوتی تا لە توانام بێت، ناگەڕێمەوە نێو ڕژێم.

گوتم: ئێستە هەستە با بچین بۆ ماڵ.
گوتی: سامان گیان، دەبێ سەرێك لە شوێنی قاچاغچییەکە بدەم تا بزانم سبەینێ دەڕۆین یا ناڕۆین.
گوتم: ناونیشانی دەزانی؟
پارچە پەڕاوێکی دەرهێنا وتی ئەمە ناونیشانێتی.
بە گوێرەی ناونیشانەکە چووین و قاچاخچییەکەمان بینی.
پاشئەوەی وریاخۆی ناساند، قاچاغچییەکە گوتی بە سەرچاو، برای بەڕێزی.بەیانی ئامادەبە گەر نەڕۆین بۆ دوو سبەی بە دڵنیاییەوە دەردەچین.
پاشان چووینە نێو بازاڕ، هێندێ خواردنمان کڕی ، سواری ئۆتۆمبیلی ئۆردوگا بووین و چووینەوە بۆ ماڵی خۆمان.
ئەو شەوە تا درەنگ نەنووستین ، بەیانی زوو هەستا، گوتی ئێستە دەچم بۆلای قاچاخچییەکە، گەر ڕۆیشتم ئەوا دوا ماڵاواییمە گەر نەڕۆیشتم، دێمەوە و شەوێکی دیکەی وەك ئەمشەو پێکەوە بە سەردەبەین کە لە مێژە خەونی پێوە دەبینم.
دڵنیابن گەر گەیشتمە هەندەران، لە یادتان ناکەم، هەرگیز لەگەڵ خێزانەکەم جیاوازیتان ناکەم.
گوتم: وریا گیان، خۆشی تۆم دەوێ، هیوادارم بە ئاسانی بگەیت و تووشی هیچ گرفتێ نەبیت.
دەستمان لە ملی یەکدی کرد، چاوی منداڵەکان و سەری نازەی ماچکرد و ماڵاوایی لێکردین.

ئەو رۆژە، پاش دەوامی مامۆستایی، چووم بۆ فرۆشتنی (پێڵاو)، لەوێوە سەرێکم لە شوێنی قاچاخچییەکاندا، دڵنیابووم ڕۆیشتووە و شەوێ ناگەڕێتەوە.

# جەژن

ژیانی ئەو سەردەمە، گرانیـیَ بێئەندازە بوو، بە تایبەت ئۆردوگا، خـەڵکی ڕۆژ بـە ڕۆژ، نـەبوون و هـەژارتر دەبـوون، بـۆ کـەمیَ ئـارد، شەکر چای وسوتەمەنی کەلوپەلی ماڵەکەی دەفرۆشت، چونکە بە هـیچ شـێوەییَ کـاری دەسـت نەدەکەوت.تەنانـەت (پـێڵاو) فرۆشـتن کەمببووەوە، تـەنیا هیـوام مووچەکەم بوو، کە (دوو، سـیَ) مـانگ جاریَ پێیان دەداین.

نزیك جەژن بووینەوە، بازاڕ چەنجاڵ ببوو، خـەڵکی کەلوپـەلیان بۆ جـەژن دەکـڕی ودڵـی منداڵـەکانیان خۆشـدەکرد، ئێمـەی هـەژار، ڕۆژانی نزیـك جـەژن، تـەزووی هـەژاریی لـە نووکی پێیـدەداین و لـە تەوقی سەرمانەوە مووەکانی سەری ڕەقدەکردین.

چاوەڕوانیی مووچـەییَ بـووم پـێش جـەژن بمـدەنیَ، تـا بتـوانم لـە بازاڕی کۆنە فرۆشان کەلوپەل بۆ منداڵەکان بکرم وخواردنی یەکەم ڕۆژی جەژن، چێشتیَ چەوربێت.

کاتیَ وانـەم دەگوتـەوە، بیروهۆشـم لای وەرگـرتنی مووچە وچوونە بازاڕ بوو بۆ فرۆشتنی جووتیَ پێڵاوی پتر تا بتوانم داواکاری (ڕۆز و سۆز) جێبەجێبکەم.

ئەو ڕۆژە بە شەرمەوە، پرسیارم لە بەڕێوەبەر کرد، کەی مووچەمان دێت؟گوتی پڕوپاگەندە گەرمە دوو ڕۆژ پێش جەژن بیدەن، چونکە دوو مانگە مووچەیان پێنەداوین.بە پەلە گەڕامەوە بۆ ماڵ هەواڵەکەم بە (نازە) گەیاند، چونکە هەر هەواڵێ خۆشم بیستایە دەمگەیانەوە تا کەمێ وورەیان بەرز کەمەوە، خۆ تا مووچەیەکیان دەداینێ، چەندینجار لە ماڵەوە بە درۆ دەکەوتینەوە، ئەوانیش وایان لێهاتبوو باوەڕیان نەدەکرد.

سێ ڕۆژ مابوو بۆ جەژن، ئەو ڕۆژە بە پەلە چووم بەرەو قوتابخانە، دەمگوت، بەڵکو ئەوڕۆ مووچە بدەن، بەڵام کە چوومە ژووری بەڕێوەبەر، گەرموگوڕ دیارنەبوو، زانیم مووچە نییە، نەمتوانی پرسیارش بکەم.چوومە پۆلەوە بۆ وانە گوتنەوە، نزیك دەوام تەواو بوون لە ژووری مامۆستایان نەدەڕۆیشتم، چاوەڕوانیی بووم، بەڵکو لە پڕێکدا هەواڵی مووچە وەرگرتن بێت.

کارگوزارێ هاتە ژووری مامۆستایان و گوتی مامۆستا سامان لە دەرەوە کوڕێ بانگت دەکات.بە پەلە هەستام وچوومە دەرگا، ئۆتۆمبیلێ وەستابوو، شوفێرەکە و یەکێکی دیکە لە تەنیشتی بوو. شوفێرەکە گوتی تۆ کاك (سامان)ی هاوڕێی کاك (وریا).گوتم من نەك هاوڕێی، برای (وریا)م. چیی بووە؟!

ئەوەی تەنیشت شوفێرەکە بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی مەترسە هیچ نەبووە، لە تاراوگە پێکەوەین، ناونیشانی تۆی پێدام ودەیگوت بە زووترین کات و پێش جەژن ئەم نامەیەی پێبگەیەنە.

نامەکـەم وەرگـرت، داوام لێکـردن بمێننـەوە، بـەڵام گـوتی داوای لێبوردندەکـەم، زۆر نـەماوە بـۆ جـەژن، دەبـێ نامـەی هاوڕێیـان بگەیەنمە کەسوکاریان، لەوانەیە هێشتا پێڕانەگەم.

زۆر بەڕێزەوە ماڵاواییان کردو ڕۆیشتن.

زەرق نامەکـەم هەڵپچـڕی، سـەیری نێـو زەرفەکـەم کـرد، دڵـم خورپەیەکی کرد، تـەزوویێ لـە مێشکیدام، مووەکانی سـەری نـەرم کـردم.وەك ئـەوە بـوو گەنجینـەیێ بدۆزمـەوە، چـونکە دۆلار کەوتـە پێشچـاوم، بـە پەلـە نامەکـەم خستـەوە گیرفانی چاکەتە شـڕەکەم، چوومە لای بەڕێوەبەر گوتم گەر یارمـەتیم بدەی دەمـەوێ بڕۆمـەوە.

گوتی مامۆستا سامان، مژدە، سبەی مووچەمان بۆ دێت.

زۆر بە سادەیی گوتم زۆر باشە، سوپاس.لە دڵی خۆما گوتم گـەر ئـەم مزگێنییە کـەمێ لەمەوبـەر دەبـوو، ئێستـە هـەر دوولا ڕوومـەتم ماچ دەکردی، بـەڵام خـوا دەرگـای خێری لێکردینـەوە، ماڵی وریـا ئاوەدانبێ.

بەرەو ماڵ هەنگاوم نا، خۆم بۆ نـەگیرا، جارێکی دیکە نامەکەم لـە گیرفـانم دەرهێنـا، بـە ئاسپایی زەرفەکـەم کـردەوە و تەماشـای نێـو زەرفەکـەم کـرد دڵـی پـتر خۆشـکردم، هـەنگاوم خێراتـر دەنـا، بـە بێئاگایی سینگم دەرپەڕانبوو، بە قیتی دەڕۆیشتم بە ڕێـوە، کـۆمی پشـتم نـەما، سـڵاوم بـە گـەرمی بـۆ ناسیاوەکانم دەکـرد، خۆشـی و گەشـیم پێـوە دیاربوو.گەیشـتمە ماڵـەوە.بانگی نـازەم کـرد و گـوتم وەرە با ئەمجارەیان بە ڕاستی دڵت خۆشکەم.

نازە:چیی بووە؟!دەزانم مووچەت وەرگرتووە.

گوتم: مووچەم وەرنەگرتووە.

نازە سارد بووەوە، چونکە هیچ هەواڵێ خۆشتر نەبوو لە هەواڵی مووچە وەرگرتن.گوتم نازە گیان، هەواڵەکە لە مووچە خۆشترە، نامەی وریا گەیشت.

نازە زۆر بە پەرۆشەوە گوتی توخوا بە ڕاستە، ئەی دەبێ چۆن بێت، چۆن گەیشتبێت؟!

- زۆرباشە، بەوەش دەزانم لە نامەکەدا جەژنانەی بۆ ناردووین. نامەکەم دەرهێنا، (نازە) لە خۆشیدا نەیدەزانی چیی بکات.ڕۆژ و سۆز گوتیان، باوکە گیان، چیی لە نامەکە دایە. کردمەوە و دوو سەد دۆلارم دەرهێنا.

حەپەسابووین، هەموو هەر سەیری دۆلارەکەمان دەکرد.گوتم با ئەوەندە بێوەفا نەبین، گوێ بگرن بزانین لە نامەکە چیی نووسیووە. لە نامەکەدا، پاش سڵاو و ڕێز، زۆر داوای لێبوردنی کردبوو دۆلارێ کەمی بۆ ناردووین، نووسیبووی دەبوایە جەژنانەتان زۆرتر بوایە. گوتم:نازە هەر ئێستە خۆتان ئامادەکەن، بچین بۆ بازاڕ، دۆلارەکە بگۆڕینەوە بە پارەی خۆمان وبچین پێوەندیی بەم ژمارە تەلەفۆنەوە بکەین، تا لەگەڵ وریا قسە بکەین، پاشان دەچینە بازاڕی تازە فرۆشان کەلوپەل بۆ منداڵەکان وخۆمانیش دەکڕین.

ڕۆژ: بابە گیان، ئەو پارە کەمە چیی پێدێت؟

گوتم: ئێستە دەچینە شوێنی پارە گۆڕەکان، بزانە ئەم دوو پارچە کاغەزە، چ پارەیێ زۆری خۆمان دەکات!!
لە نووسینگەیێ پارەکەمان گۆڕییەوە، پارەیێ زۆری خۆمانی کرد، سۆز و ڕۆز بینیان زۆر دڵیان خۆشبوو، چونکە داواکارییان پێدابین دەبوو.چووین بۆ نووسینگەی تەلەفۆن وفاکسی جیهانیی، ژمارەکەمان بە پرسگەی نووسینگەکەدا، پاش کەمێ چاوەڕوانیی گوتیان بچنە کابینەی ژمارە شەش.
تێلێفۆنەکەم هەڵگرت، گوتم ئەلو، خۆتی وریا گیان.
گوتی قوربانت بم سامان گیان، چۆنن، چەند مانگێکە هەواڵتان نازانم.بەڵام وا ڕێکەوت، ئەو هاوڕێیەم دەهاتەوە بۆ هەولێر، بە هەلمزانی، نامەیەکتان بۆ بنێرم.
– وریا گیان، سوپاس بۆ نامەکە، بەڵام ئێمە تۆمان بە پارەوە ناوێ.
– داوای لێبوردندەکەم، جەژنانەیێ زۆر کەمبوو.
– زۆر سوپاس، حەزناکەم جارێکی دی دووبارەی بکەیەوە.
– گیرفانی من و تۆ هەمیشە هەر یەکبووە.
– تۆ لە وڵاتی غەریبیت، هەردەم پارەت پێویست دەبێ.
گوتی: لێرە ئەوەی بیری لێنەکرێتەوە پارەیە، بەڵام ئازار و دەردی غەریبی ناخۆشوگرانە، خۆشییەکانی ئێرەت لە پێشچاو دەخات.
ماوەیێ باش، هەر چوارمان لەگەڵ وریا قسەمان کرد، ئیدی چووین بەرەو بازاڕی تازە فرۆشان، جلوبەرگی جوان و نایابمان

کڕی، تێلێفیزیۆنیٚ ڕەشوسپیی و پێویستی جەژنمان دابینکرد، گەڕاینەوە.ماوەیێ زۆربوو، تریقەی پێکەنینی (ڕۆز و سۆز)م لە ناخی دڵیانەوە نەبیستبوو، ئەو ئێوارەیە بینیم وبیستم.
بۆ سبەینێش مووچەکەم وەرگرت، لە قەرزاریش ڕزگاربووین وجەژنیٚ خۆشمان لە سایەی (وریا)وە، بە سەربرد.

# ڕێکخراوی بیانی

پاش هەفتەیێ دوای جەژن، ئەو ئێوارەیە زوو کارەبا هاتەوە، لە بەشی ئاگادارییەکان، بڵاوی کردەوە، ڕێکخراوێکی بیانی پێویستی بە چەند کارمەندێ هەیە، کۆلێژی بەشی ئینگلیزیی تەواوکردبێ. بە پەلە ناونیشانەکەم نووسی و گوتم نازە، سبەینێ دەچم فۆرم وەردەگرم، گەر وەریانگرتم واز لە مامۆستایی دێنم، چونکە ئەوەی لەو شوێنانە کار بکات بە ئاسانی بە خاوەنی هەموو شتێ دەبێ.

نازە گوتی سامان دەبێ وەرتگرن؟

– لە زمانی ئینگلیزیی زۆر لە خۆم ڕادەبینم، بە دڵنیاییەوە لە تاقیکردنەوە وچاوپێکەوتن بە نمرەیەکی باشەوە دەردەچم.

ئەو شەوە خەوم لێنەدەکەوت، ئاخۆ دەبێ کەی بەیانی بێ و بە پەلە بچم بۆ ئەو ڕێکخراوە بیانییە و فۆرم وەرگرم.

بەیانی هات، خۆم گەیاندە پرسگەی ڕێکخراوەکە، فۆرمیان پێدام و کاتیان دیاریکرد بۆ گەڕانەوەی فۆرمەکان وتاقیکردنەوە.

پاش یەك هەفتە، بەشداربووم لە تاقیکردنەوەی ڕێکخراوەکە، چونکە زۆر بۆی پەرۆشبووم، بە یەکەم دەرچووم، وەریانگرتم و وازم لە مامۆستایی هێنا.بووم بە چاودێر و مانگانە سێ سەد

دۆلارم وەردەگرت، بۆ ئەو سەردەمە پارەیێ زۆربوو، ژیانم گۆڕا، بووم بە ئەندامێکی چالاکی ئەو ڕێکخراوە بیانییە، لە بواری گەشەپێدانی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی.پاش ساڵێ بووم بە لێپرسراوی بەش و مووچەکەم بوو بە مووچەیەکی خەیاڵی کە هیچ کاتێ بیرم لەو جۆرە مووچەیە نەکردبووەوە.

ژیانی ئۆردوگام جێهێشت، چوومە ژیانی نێو شارەوە، باشترین خانووم بە کرێ گرت، جوانترین وباشترین کەلوپەلی ماڵم کڕی، جگە لە کڕینی ئۆتۆمبیلێ بۆ هاتووچۆی ڕێکخراو کە پێشتر هەر بە لاندکرۆزی ڕێکخراوەکە هاتووچۆیان پێدەکردم.هەفتانە لە ڕێکخراوەکەوە پێوەندییم بە (ووریا)وە دەکرد، ئەویش زۆر خۆشحاڵبوو کە ژیانمان گۆڕابوو.زۆری نەخایاند پارچەیێ زەویم کڕی، ئەندازیارێ نەخشەی دانا، خانووەکەی بۆ تەواوکردم. خۆشگوزەرانی ڕووی تێکردبووین، میوانی زۆرم دەهات و ژوورێ تایبەتم هەبوو تەنیا بۆ میوان.بێدڵی منداڵەکانم نەدەکرد وتۆڵەی چەند ساڵەی هەژارییم بۆ کردبوونەوە، هەر کات بمزانیایە نزیکی ئەوەن ڕابردوو بیرکەن، بە زوویی دەمهێنایەوە یادیان.دەمویست ژیرانە بیر لە ژیان بکەنەوە، "سوود لە ڕابردوو وەرگرن لە پێناو سەرکەوتنی ژیانی ئایندەیان".زۆرجار پێمدەگوتن باوباپیران دەڵێن "مەنازە بە بوون، مەگری بە نەبوون، هیچیان تا سەرنین، چ بوون چ نەبوون".تا دڵنیابن، مەرج نییە وا بژیین، بە تایبەت ئێمە، لە ولاتێ دەژین، ولاتی قەزاوقەدەرە، پڕیەتیی لە کارەساتی دڵتەزێن.

## ڕوخانی ڕژێم

شەشەمین ساڵ بوو لەو ڕێکخراوە کارم دەکرد، (وریا) ساڵێ بوو مافی پەنابەری رامیارییان پێدابوو.

ئەو ڕژێمەی، سیوپێنج ساڵ وڵاتی وێرانەکردبوو، بۆ قڕکردنی گەلمان چەندین شێوازی نامرۆیانەی بەکاردەهێنا، وەك چەکی کیمیایی، ڕوخان وسوتانی گوندەکان وئەنفالکردنی نزیك دوو سەد هەزار کەس لە ژن و منداڵ، کچان وکوڕان، پیروپەککەوتە. بەمانەوەش نەوەستا، دەیویست هیتلەر ئاسا، جیهان بتۆقێنێ و داگیری بکات.کاتێ کارەساتی ڕووخانی تەلاری بازرگانی لە ئەمریکا، لە مانگی سیپتەمبەر ساڵی ٢٠٠٢ ڕوویدا، وڵاتانی زلهێز بڕیاری بنبڕکردنی تیرۆریان لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە وەرگرت، دووەم تیرۆریست و دیکتاتۆری جیهان (سەدام)ی خوێن مژ بوو، کە نۆرەی لە ناوبردنی هات، گاڵتەی بە بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرد.

تا لە کاتی (سفر) پەلاماردرا، خۆی ودەسوپێوەندەکەی لە ماوەی چەند ڕۆژێ ڕایانکرد وخۆیان حەشاردا، "کونە مشکیان لێبووە قەیسەری"، چییان بە سەر خەڵکی هێنا، هەمان شێوە بە سەر

خۆیـان هات.جاری یـەکیٚ لـە دارودەسـەکەی لـە حەشـارگە و مـالآن دەدۆزرانەوە وبەندەکران، هەر دوو کوڕەکەی لە شەڕیٚکدا کوژران و جەرگی سووتا، ژن و کچەکەی، بۆ پەنابەریٚتی خۆیـان گەیانـدبووە ولآتـان، خۆیشـی لـە حەشـارگەییٚ، نزیـك شـویٚنی لـە دایكبـوونی دۆزرایەوە، زۆر ترسنۆکانە خۆی بە دەستەوەدا.

خـەڵكی، لـە ناوچـوونی ڕژیٚمیـان وەك خـەونیٚ دەبـینی، باوەڕیـان نـەدەکرد، ئـەو دیکتـاتۆرە زۆردارە لـە نـاو بچـیٚت، بـەلآم پیٚشـینان ڕاسـتیان گوتـووە، "هــەموو شـتیٚ لــە بـاریکی دەپسـیٚ، تــەنیا زوڵموزۆرداری لە ئەستووریدا".

ئــازادی ڕووی لــە ولآت کـرد، خــەڵكی ئەگەڕانــەوە بــۆ زیٚــدی باوباپیران. سەردانییٚ بە پەلەم کرد بۆ ماڵی برام و باوکی وریا و ئەحمـەد، بـەلآم ئەحمـەد لـە مـالٚ نـەبوو، تـەنیا دایکـی و گەلاویـٚژ بـوون، ئـەوەی خـەمیٚکی لـە دلّـم چـاندەوە گەلاویـٚژ بـوو، هیٚشـتا ئاسایی نەببووەوە. حەزمدەکرد ئەحمەدم ببینیایە و ڕیٚگەچارەمان بــۆ چارەســەری گەلاویـــٚژ دابنایــە، بــەلآم بــە هــۆی دەوامــی ڕیٚکخراوەکەمەوە گەڕامەوە، ئەو خەمەم هەڵگرت بۆ کاتیٚ دیکە.

لە ڕیٚکخراوەکەوە، پیٚوەندییم بە (وریا)وەکرد، هەواڵی شارم بۆ باسکرد، نـامۆیی پـتر پەرۆشـی کـرد، هـەموو ئـاواتی گەڕانـەوە بوو، دوا داواکاری وریـا، چـۆن بتـوانیٚ ڕیٚبـوار ئاشـت کاتـەوە، ناحــەزی لــە نیٚوانیــان نــەمیٚنیٚ.گوتم دڵنیابــە، کــە هاتیــەوە، دەچینە لای ڕیٚبوار گەر بە پارەش بیٚ دڵی ڕازی دەکەین.

وریا وتی کەواتە لەم هەفتەیە دێمەوە، هەر خۆت وەرە بۆ سنوورو بە کەس مەڵێ، گەر کێشەکەم لەگەڵ (رێبوار) چارەسەر بوو، بە یەکجاری دێمەوە وخۆم لە ولاتی غەریبیی ڕزگاردەکەم.

- دڵنیابە وریا گیان، کێشەکە زۆر بە ئاسانی چارەسەر دەکەم و هەر خۆم دەزانم چیی پێدەڵێم.

وریا :چیی پێدەڵێی؟!

- کەی پێکەوە چووینە لای رێبوار، ئەوسا دەزانی چیی دەڵێم وچۆن چارەسەری کێشەکە دەکەم.

پاش شەش ڕۆژ، وریا پێوەندییکرد، گوتی سبەینێ ئێوارێ، دەگەمە سنووری (ئیبراهیم خەلیل)، دەمەوێ هەر خۆت بێی و کەس تێنەگەیەنی.

- بە چاوان.هەفتەیێ مۆڵەتم لە ڕێکخراوەکەم وەرگرت.

## پێشوازیی

ئەو ڕۆژە خەڵکی لە هەندەرانەوە زۆر دەهاتنەوە، هەر جاری کۆمەڵێ دەپەڕینەوە، لە دوورەوە بینیم، بە جانتا چوارتاییەکەیەوە، هێدی هێدی دەهات و چاوی دەگێڕا.

گەیشتە خاکی کوردستان و منی بەدی کرد، باوەشمان بە یەکدیا کرد، پێکەنین و گریان تێکەڵببوون، دەیگوت ئەمە منم گەیشتمە ئەو ڕۆژەی بتبینمەوە,جارێکی دی هەوای نیشتمان هەڵمژم ، غوربەتی وازم لێبێنێ وچیدی تەوقی لە گەردن نەنێمەوە.

گوتم :با بچینەوە، بە بینینی شارەکەمان وکەسوکاردڵخۆشتر دەبیت.................

هۆڕینم لێدا و دەرگایان کردەوە، یەکسەر چوومە ژوورەوە، کە وریا دابەزی، نازە سەریسوڕما گوتی:

باوەڕناکەم، ئەمە کاك وریا نییە!!.

وریا سەری نازەی ماچکرد، گوتی براژن، باوەڕتبێ وریام، باوەشی لە سۆز و ڕۆز دا و لە ئامێزی گرتن.وەدەیگوت، ماشەڵڵا گەورە بوونە.

– وریا ئەمانە دەبینم، ئینجا هەستدەکەم، تەمەنمان زۆر ڕۆیشتووە، بەڵام بێ ئاگاین.

– ئێمە تازە ژیانمان بۆ چییە، ئەو تەمەنەی کە ماوە لە پێناو ئەمانەدا بەکاری دەهێنین.

ئەو شەوەمان لەماڵی ئێمە بە سەر برد، بەیانی زوو، بێترسی زاڵگەکان، چووینەوە بۆ شارەکەمان.

بەو بەیانیە زووە، لە پێش دەرگایان ئۆتۆمبیلەکەم وەستان.وریا ویستی دابەزێ.گوتم دانەبەزی، با بچم مژدەیان بدەمێ.

لە دەرگامدا چرۆ دەرگای کردەوە، بە گلەییکردنەوە، گوتم چرۆخان، دەبێ لە زاری خەڵکییەوە ببیستم وریا هاتوەتەوە؟!

– کاك سامان، هێشتا نەهاتوەتەوە، بە نیازە دوو هەفتەی دیکە بێتەوە.

– بە ڕاستە!، دوو هەفتەی دیکە!!

– لە تێلێفۆن وای پێگوتووم.

– ئەی ئەگەر ئەوڕۆ هاتەوە، مژدانەکەم چییدەبێ؟

– زۆر بیری دەکەم، نەك هەر لەبەرخۆم، حەزدەکەم زوو بێتەوە لەبەر منداڵەکان.

– کەواتە مزگێنیم دەوێ، وا لە نێو ئۆتۆمبیلەکەمە.

بانگی وریام کرد و هاتە ژوورەوە، چرۆ قسەی بۆ نەدەکرا. وریا گوتی بۆ وا لاڵبووی؟

گریانی خۆشی لە ناخی دڵییەوە دەهاتەدەر، گەر شەرمی نەکردبایە، باوەشی لە وریا دەدا، بەڵام وریا زانی زۆرکاری لێکرد، دەستی لە ملی کرد,ماچی کرد گوتی وا لە خۆت مەکە، بۆ هەر

شوێنێ بچم هەر بۆ لای خۆت دێمەوە.باوکی وریا، لە ژوورەکەیەوە دەرکەوت، تەواو پیری پێوە دیاربوو، گوتی:

کوڕەکەم، گوێم لە دەنگتە، قوربانتبم کوڕی باوکی، هاتیتەوە؟!

وریا پەلاماری دەسیدا و ماچیکرد، ئەویش باوەشی لە وریادا و لە پڕمەی گریانیدا ، هەمووانی گریان.

منداڵەکان لە خەو هەستان، وریا ئامێزی بۆ کردنەوە خۆیان گەیاندە باوکیان .

هانا: باوکە گیان، ئیدی جێمان مەهێڵە، ژیان بێ تۆ زۆر ناخۆشە.

وتم: دڵنیابە جێتان ناهێڵێ.

زۆر نەماینەوە گوتم با بچین بۆ دەرەوە وسەردانییێ ڕێبوار بکەین.

باوکی وریا گوتی مەچن، کوڕەکانم مەچن، چەند برادەرێ لە ڕیش سپیانیی گەڕەك دەنێرین.

– مامە گیان خەمت نەبێ، سەرێ دەدەین، خۆ نامانکوژن، بزانین چیی دەڵێن و نیازیان چییە.

– وابێ خۆمیش دێم.

– تەنیا من و وریا دەچین، با بزانێ چەند کاتژمێرێکە وریا هاتووەتەوە، کێشەکەی لە بیرە و پشتگوێی نەخستووە ورێزی بۆ داناوە، هەر بۆیە یەکەمین کەس سەردانی دەکرێ.

– بچن کوڕەکانم، خوا ئاگادارتانبێ، زۆر ئاگاداری خۆتانبن.

نزیك ماڵی ڕێبوار بووینەوە، ئەو ڕێیەی چەند ساڵێ لەمەوبەر پێیدا چووین نەگۆڕابوو، تەنانەت چڵپاوی پێش ماڵی ڕێبوار هەر مابوو،

مراوییەکان دەنووکیان تێنابوو، بەڵگەیێ بوو بۆ پشتگوێ خستنی شارەکەمان لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە.
لە دەرگاماندا، خوشکەکەی هات و دەرگای کردەوە.
گوتم :ڕێبوار لەماڵە؟
زۆر شپرزە بوو، گوتی نازانم.
گوتم: هێشتا وازتان لە وشەی (نازانم) نەهێناوە.
بە پەلە چووە ژوورەوە، ڕێبوار هات ، زۆر بە ساردییەوە، تەوقەی کرد و فەرمووی لێکردین.لە هەمان ژووری جارانی دانیشتین، بە بێزارییەوە خێرهاتنی لێکردین.
پاش کەمێ بێدەنگی. گوتم ڕێبوار، ئێمە تۆمان بە پیاو داناوە، بۆیە بۆ ماڵت هاتووین، وریا، چەند کاتژمێرێکە گەیشتووەتەوە، کەچیی بە پێویستی زانی بێ بۆ لای تۆ.
گوتی :وریا ، دەزانێ چەند تاوانبارە بەرانبەرم، بۆیە هاتووە.
- من هیچ تاوانبار نیم و نەمگوتووە تۆ لە حیزبێ ئیسلامی کار دەکەی، گەر بمگوتایە، دان پێهێنان بوو بۆ خۆم ، دادگا پازدە ساڵ زیندانی بۆ دەردەکردم، من گوتوومە، تۆ ئێمەت گەیاندووە و تەنانەت ناوی (سامان)مدا، کە خۆشەویسترین هاوڕێمە، چونکە شتێ شاراوە نەبوو، بەڵام من چیی بکەم، تۆ بەرەنگاری ئازارو ئەشکەنجەدانت نەگرت و دانت بەوەدا نا لەو حیزبە کاردەکەی.
- ئەو قسانەی وریا دەیکات ڕاستە، تەنانەت ناوی منی دابوو.
-ئێستە ئێوە چییتان لە من دەوێ؟

– دەمانەوێ هیچ شتێ لە دڵت نەمێنێ بەرانبەر وریا و لێیبووری.
– ئەوەی وریا کردی، دوژمنداریی بوو، پازدە ساڵ دادگایی کرام و شەش ساڵ لە زیندانی ئەبو غرێب بووم، گەر بە هۆی ڕووخانی رژێمەوە نەبوایە، نۆ ساڵی دیکەی تێدادەبووم، جا بە چ گیانی لێبووردنەوە، لێیبوورم.
– تۆ چییت دەوێ، ئامادەم داواکارییەکەت جێبەجێ بکەم، سەرەڕای ئەوەی خۆم بە تاوانبار نازانم.
وتم :ڕێبوار، تۆ تاوانباری بەرانبەرمان، بە تایبەت بەرانبەر ئەحمەد، کە بە هۆی تۆوە منداڵێکی تاقانەی لەو ڕێیە گیانی پاکی سپارد و ژنەکەی شێت بوو.
– تۆ چیی دەڵێی، ئێوە هاتوون تاوانبارم بکەن و چەند ساڵێ دیکە بەندکرێمەوە.
ئێمە – وا ناکەین و لێمان ناوەشێتەوە، بەڵام بیرت دێت، لەو بیابانە چۆڵە کە هیچ ئاوەدانییێ بەدی نەدەکرا، گرتت بە قۆڵی منداڵەکەی ئەحمەد، بە توندی فڕێت دایە نێو خێمەکەوە، دەتوت بە هۆی ئەم منداڵەوە ئاشکرا دەبین.ئەو منداڵە تاقانەیە، بەو فڕێدانە، تۆقی و زۆر ترسا، ئەو ترسە لە دڵی دەرنەچوو، تا تووشی نەخۆشیێ کوشندەی مێشکی کرد، لە گەڕانەوەدا، چەندجارێ ڕشایەوە، لە کۆتاییدا گیانی پاکی سپارد، ئێمە، لەبەر ماندووبوون و تینویەتیی و برسیەتیی، نەمانتوانی هەڵیگرین، بە ناچاری لە گۆڕێ بچووک ناشتمان، کە دایکی ئەو دیمەنە دڵتەزێنەی بینی و گۆڕی

کوڕەکەیمان جێهێشت، شێت بوو، تا ئێستەش باری دەروونی خراپە. ئەم بەسەرهاتەت دەزانی؟ئایا تا ئێستە ئەحمەد یەخەتی گرتووە؟

ئەی ئەمە دڵگەورەیی و گیانی لە خۆبووردن نییە؟

سەری هەڵبڕی، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

تا ئێستە ئەم بەسەرهاتەم نەزانیووە بە هۆی منەوە بوو بێت، زۆرم پێناخۆشە، بە ڕاستیی دەمەوێ سەردانیی ئەحمەد بکەم و زۆر داوای لێبوردنی لێبکەم.

– ئەوە ڕاستییەکە ویستم بیزانی، گەر حەزت پێبێ، هەر ئێستە ئەچین.

– دەمەوێ بە تەنیا بچم.

– با هەر ئێستە بە ئۆتۆمبیلەکەم بچین.

کەمێ بیریکردەوە، بە کزییەکەوە، گوتی باشە با بچین.

هەرسێکمان سواری ئۆتۆمبیل بووین و چووین بەرەو ماڵی ئەحمەد.

لە دەرگامدا، کراوە بوو، ڕاستەوخۆ چووینە ژوورەوە، گەلاوێژ گەش بووەوە، بە زەردەخەنەوە ویستی بەرەو ڕوومان بێ، لە ناکاو هاواری کرد و ڕایکردە ژوورەکەیەوە و دەرگای لە خۆی داخست.

(ئەحمەد) لە ژووری میوانەوە، بە پەلە هاتە دەرەوە، کە ئێمەی بینی، هەر لە دوورەوە باوەشی بۆ کردینەوە، تەنانەت، ئەو باوەشەی بۆ (ڕێبوار)یش کردەوە. چووینە ژوورەوە و دانیشتین.

وتم :نازانم گەلاوێژخان بۆ وایکرد، لە سەرەتاوە ویستی بەرەو ڕوومانبێ، بەڵام لە پڕ هاواریکرد و ڕایکرد ژوورەکەی.
ئەحمەد: بە یارمەتیتان، بزانم بۆچیی وایکرد، چونکە ماوەیێ لەمەوبەر بردمە لای دکتۆرێ، ئێستە زۆر لە جاران باشترە.یارمەتی وەرگرت و چوو بۆلای گەلاوێژ ، کە زۆری پێچوو، منیش بۆ لایان چووم.ئەحمەد گوتی گەلاوێژ دەڵێ، ئەو کوڕەی (دانا)ی کوشت، نەمتوانی تەماشای بکەم، هەر بۆیە ڕامکرد .
گوتم: ئەحمەد، ڕێبوار هاتووە تا داوای لێبوردنت لێبکات، چونکە باسم بۆ کرد کە بە هۆیەوە، (دانا)مان لە ڕێگە گیانی سپارد
ئەحمەد: من هیچم لێی ناوی، لێی دەبوورم.
گوتم: دەزانم، تۆ هەر لە مێژە لێی بوراوی، بەڵام دەمەوێ کێشەی نێوان خۆی و وریا چاکبێ، چونکە ئەو بە نیاز نییە بە ئاسانی لەو شەش ساڵ زیندانییەی کە لە نێوچەوان (وریا)ی دەزانێ، خۆشبێ.
ڕووم کردە گەلاوێژخان گوتم دڵت گەورەبێ، پێویست ناکا خەم لە هیچ شتێ بخۆی.بە ئەحمەدم گوت با بچین بۆلای (ڕێبوار و وریا).
وریا: توخوا گەلاوێژخان چۆنە و بۆ وایکرد، وا دیارە هێشتا بە تەواوی چاك نەبووەتەوە.
ئەحمەد: باشتر ببوو، بەڵام ئێستە کاکە (ڕێبوار)ی بینی، (دانا)ی کوڕی هاتەوە یاد.ڕێبوار تێگەیشت تاوانێ گەورەی کردووە، بۆی دەرکەوت کە دڵی ئەحمەد چەند گەورەیە.ئارەقی شەرمەزاریی بە نێوچەوانیدا هاتە خوارەوە، نەیدەزانی چیی بڵێ، لە پڕدا گوتی:

نازانم چییبڵێم، تەنیا دەسەڵات کە هەمبێ، دەتوانم بڵێم "ئەمە ملی من و چەقۆی تۆ" چونکە تا سامان باسەکەی بۆ نەکردم نەمزانیوە.
ئەحمەد:ئێمە براین، پێویستە گیانی لێبوردنمان بەرانبەر یەکدی هەبێ، بەڵام من یەك داواکاریم هەیە؟زۆر بە پەرۆشەوە، گوتی هەرچیی دەڵێی دەیکەمە سەرچاوم.
ئەحمەد: چۆن من هیچ لە دڵم نەماوە بەرانبەری تۆ، دەمەوێ تۆش هیچ لە دڵت نەمینێ بەرانبەر وریا.ڕێبوار بێدەنگبوو، کەمێ بیری کردەوە ووتی: گەر بڵێم بەرانبەر وریا دڵم پاکە، ڕاست ناکەم، بەڵام لە سەر دەستی تۆ و سامان، لەم ساتەوە، بە دڵنیاییەوە، هیچ لە دڵم نەما وریا وەك برامە.
ئەحمەد: دە فەرموون دەستبکەنە ملی یەکدی، با گیانی تەباییی و برایەتیی لە نێوانمان دروستبێ، نەك گیانی تۆڵە سەندن.
وریا بە پەلە هەستا، هەر دووکیان یەکدیان ماچکرد.منیش دڵم ئۆخەی کرد کە گرفتەکەمان چارەسەرکرد.
گوتم: پێم بڵێ، ئێستە چیی دەکەی ، (محەمەد)ی برات چیی دەکا.
گوتی: من شوفێری ئۆتۆمبیلێکی برادەرێکم و (محەمەد)ی برام چایچییە لە پێشانگەی ئۆتۆمبیلان.
وریا :گەلاوێژخانت بۆ لای چ دکتۆرێ بردووە؟
– ماوەیێ لەمەوبەر بۆ دکتۆرێکی دەروونناسی زۆر باشم برد. دەرمانی باشی هەیە و بەکاری دێنێ، لەو ڕۆژەوە باشبووە.

که گوتمان دەڕۆین، زۆر هەوڵیاندا نیوەڕۆ بمێنینەوە.وتم پێویست ناکات، ماڵی (وریا) چاوەڕوانن.

ئەحمەد: داوای لێبوردن دەکەم ئێستە ناتوانم، دەمەوێ گەلاوێژ جێنەهێڵم، بەڵام شەو دێین.

نەمدەویست زۆری لێبکەم، مالآواییمان لێکردن ودەرچووین.

رێبوار: ئەم نیوەڕۆیە دەچینە ماڵی ئێمە.

وتم :تۆ هەر دەبێ لەگەڵمان بێی.

وریا : رێبوار لەبەر دڵی باوکم، حەزدەکەم ئەم نیوەڕۆیە پێکەوەبین.

ڕووی ئۆتۆمبیلم کردە ماڵی (وریا) و گوتم بە خوا دانابەزی.

گوتی دڵتان ناشکێنم، ئێوە برای منن.

باوکی وریا بینی ڕێبوار لەگەڵمانە، بە گەرمی خێرهاتنەوەی لێکردین ودەستی کردە ملی رێبوار گوتی تۆش کوڕی منی هەر وەك، وریا و سامان.ئەویش دەستی باوکی وریای ماچکرد، گوتی تۆش باوکی هەمووانی.بە چارەسەری کێشەکە خۆشیی ڕووی تێکردینەوە.

تا شەوێ درەنگ لە ماڵ وریا ماینەوە، چونکە میوانیێ زۆر هاتبوو.

پاش چەند ڕۆژێ چووینە لای هاوڕێیەکی ئەحمەد، کە نووسینگەی زەوی هەبوو، دوو پارچە زەویمان کڕی لە سەر زێی خاسە، هەر نووسینگەکە بەڵێنیدا بە ئەندازیاری تایبەتی خۆیان و بە نەخشەیەکی نوێ لە ماوەی سێ مانگدا خانووەکەمان بۆ تەواوبکا.

پاش بینینی نەخشەکە گوتمان دەست بەکاربن.

پاشان چووینه سەر قەڵای شارەکەمان، گڕی سۆزوبەزەیی لە دڵودەروونمان هەڵگیرسان، ڕقوکینەی دژ بە دوژمنانی گەلمان توندتر کرد کە هەمیشە بۆ کوردستانی بوونی شارەکەمان پیلانە پیس وگڵاوەکانیان دادەڕێژن، بێخزمەت و وێرانەی دەکەن ، هەر لەوێوە چووینە نێو بازاڕ و سەرمان لە مەیدانی کرێکاراندا، موچڕك و تەزووی هەژاریی هێنایەوە یادمان، زۆر سوپاسی یەزدانمان کرد، لە کابوسی هەژاریی ڕزگاری کردووین، ژیانیٚ خۆشی پێبەخشین. چووینەوە چایخانەکەی (مام موراد)، هەمان دیکۆر بوو و نەگۆڕابوو، تەنانەت کورسییە شلۆقەکانی هەر مابوو. ئێوارێش (چرۆ)مان لەگەڵ گەلاوێژ، بۆلای دکتۆریٚ باش برد، داوای لێکردین، دوو مانگ بەردەوامبین لە هاتووچۆ بۆ چارەسەرکردن، دڵنیای کردینەوە، بە پەیڕەوکردنیٚ ڕێنماییەکانی بە ئاسانی چاکی دەکاتەوە.بڕێك پارەمان بۆ ئەو دوو مانگە تەرخانکرد، دامانە دەست (محەمەد) برای و چونکە دەمانزانی ئەحمەد وەریناگریٚ.

شەویٚ بە هەمان شێوە، ماڵی وریا جەنجاڵبوو، (فایەق)ش هاتبوو، وێڕای ئەوەی زویر ببوو لە وریا، چونکە داوای پارەی ئەو زیانەی کردبوو کە بە هۆی سنوورداشمانەوە تووشی ببووین، (وریا)ش ئەم داواکارییەی پەسەند نەکردبوو.فایەق هەر هەستی لێڕادەگرتین، هیچ نەگۆڕابوو، قسەکانی هەر ناخۆش و ڕەقبوون.

# گەڕانەوە بۆ شارەکەم

دوای تێپەڕبوونی سێ مانگ، کاتی ئەوە بوو کلیلی خانووەکەمان وەربگرین وخانووەکەی هەولێر بۆ ئەو کرپارە چۆڵبکەم کە سێ مانگ لەمەوبەر لێی کڕیبووم، دەبێ خاوەنی بەلێنەکەم بم.ووریا بە مۆبایلەکەی پێوەندیی پێوەکردم، بە زووترین کات ماڵی هەر دوولامان بگوازینەوە نێو خانووەکانمان چونکە تەواوبووە.
چووینە خانووەکەمانەوە، جارێکی دیکە بە شارەکەمان ئاشناوشاد بووینەوە.ئەو ئێوارەیە لە سەر بانی خانووەکەمانەوە تەماشای ڕووباری (خاسە)م دەکرد، ئەو ڕووبارەی لە کاتی ڕژێمدا وشك وبرینگبوو، ئێستە بە ئاوی سازگاری قەت پاڵی چیاکان تینویەتیی شکاوە، خۆر لە کاتی ئاوابووندا بووئەو دەقەرەی سوورکردبوو، تیشکەکەی لەگەڵ شەپۆلی ڕووبارەکەدا تێکەڵبوو، لە نێو دارستانی کەناری ڕووبارەکەش چاوشارکێیان بوو، کچان و کوڕان لە جێژوانی ئێوارەیاندا لە سەر کورسییەکانی ئەو کەنارە دانیشتبوون، بە هێمنی باسی ئایندەی خۆیان دەکرد، لەو کاتە دەمویست بانگی (نازە) بکەم، تەماشای خوارەم کرد، ڕۆژ وسۆز لە باخەکە خویندنیان دەکرد، بەڵام نازە دیار نەبوو، گوتم ڕۆژ بانگی دایە بکە

بۆ سەربان بێت، ئەویش بە دەنگە ناسکەکەی بە دایکی گوت کە بگاتە سەربان. نازە هاتە سەربان، نەیدەزانی بۆچیی بانگم کردووە، گوتی سامان گیان چییتدەوێ؟ گوتم تۆ سەیری ئەم دیمەنە دڵفرێنە بکە چ کەشێکی ڕۆمانسییە!!زۆری پێ جوانبوو گوتی بە ڕاستی وایە خۆت گوتەنی کەشێکی ڕۆمانسییە!.

تیشکی سووری خۆراوابوون کوڵمەکانی وەك سێوە لاسوورە ئاسای لێکردبوو، ڕەنگێکی خورمایی بەخشیبوو بەو قژەی نیوەی بالآی داپۆشیبوو، پێمگوت کەوابێت قەرزاری ماچێکی.

گوتی:لێرە نابێت، یەکێ دەمانبینێت.

پاش خۆراوابوون قۆڵی خستە نێو قۆڵم گوتی با بچینە خوارەوە خواردنی ئێوارەش ئامادەیە.

هاتەوە یادم و گریانم بۆ ڕۆژانی هەژاریی و نەدارییمان دەهات گوتم نازە گیان دێتەوە یادت چەندین ساڵ لەمەوبەر گیرۆدەی دەستی هەژاریی ببووین، شەوێکیان خەونێکی خۆشم بینی، هەستدەکەم ئێستە ئەو خەونەیە کە تێیدا بووم!! "جا نازانم ئەو خەونەی چەند ساڵێ لەمەوپێش بینیم ژیانی ڕاستەقینەم بووە وبە خەونم زانیووە، هەژاریی و بەسەرهاتەکانیش خەونبوونە وئێستە بە ئاگا هاتووم، یا بە پێچەوانەوەیە"!.

گوتی: هەر کامیان بێ، گرنگ ئەوەیە ئێستە لە ژیانی خۆشیداین.

گوتم :گەر خەون بووبێ ئەوا هاتە دی، بەڵام كاتی خۆی خەونێكی دیكەم بینی، دەبێ ئەوەش بێنمە دی.

نازە:ئەویان چ خەونێ بوو؟

– كاتێ لە بیابانەكە بووین، خەریكبوو لە تینویەتیی و برسیەتییدا بمرین، من و وریا ئێوەمان جێهێشت تا بچین ئاوەدانیێ بدۆزینەوە، هەردووكمان لە ڕێ زۆر ماندووبووین و لێی نووستین، پیاوێ بە ساڵاچوو هاتە خەونم، لە ئەنفالكراوان بوو، پێی گوتم "هەستن نزیك ئاوەدانیی بوونەتەوە، ڕایسپاردم و گوتی: "گەر وڵات ئازادبوو، بمانگەیەننەوە كوردستان، با ئێسك و پروسكمان تێكەڵ بە لمی بیابان نەبێ، تێكەڵ بە خۆڵی سووری خاكی كوردستان بێت".

نازە :هاتەوە بیرم، بەڵام بۆ ئەمیان چییدەكەی؟

– هەر سبەینێ، (خۆم، وریا ، ئەحمەد و ڕێبوار) دەچین بۆ (وەزارەتی ماف مرۆڤ )، ڕاستییەكانیان پێدەڵێین، هەروەها دەڵێین زۆر ماڵی بەدوو شایەتحاڵ دەبن بۆ دۆزینەوەی شوێنی ئەنفالەكان.

نازە: باسی ئەو پیرێژنە بكەن، كە بە دووماندا دەگریا و دەیگوت "ئێوە كوردن، كوردێكی زۆریان لێرە زیندە بە چاڵكرد، گەر بتانگرن وەك ئەوانتان لێدەكەن".

مۆبایلەكەم دەرهێنا و لەگەڵ وریا قسەم كرد و بڕیارماندا ، سبەینێ هەر چوارمان بچین بۆ وەزارەت.

بۆ بەیانی هەرچوارمان، هەموو کاریکمان لادایە لاوە، چووین بۆ وەزارەت، ئەوانیش لیژنەیێ تایبەتیان پیکهینابوو بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی چارەنووسی ئەنفالکراوان، هیندێ فایلیان پیشاندان، کە لەو کەسانەبوون زانیاریان لە بارەی ئەنفالکراوانەوە پیدابوون.زانیارییەکانی ئیمەیان نووسی و زۆریان پیباشبوو.

# ڕوفاتی پیرۆزی ئەنفالکراوان

شەوێکیان لە کەناڵەکان ئاگادارییان بڵاوکردەوە، "بەهۆی ڕاستیی ئەو زانیاریانەی لە لایەن هاوڵاتییانەوە وەرگیراوە، وەزارەتەکەمان بە پاڵپشتی لیژنەییٚ لە وڵاتانی هاوپەیمان، چەند گۆڕێکی بە کۆمەڵیان دۆزیوەتەوە، بە جلوبەرگ وناسنامەکان دەرکەوتووە کوردن، خەڵکی ناوچەی گەرمیان و بادینانن".

لە ناوچەی گەرمیان و دەڤەری بادینان شوێنیان بۆ (مەزاری شەهیدانی قوربانیانی ئەنفال) دیاریکرد، کاتی هێنانەوەی ڕووفاتی ئەنفالکراوان بۆ خاکی نیشتمان دیاریکرا، چەندین هەزار کورد، لە (حەمرین)ی سنووری کوردستان لەمبەر و لەوبەری شەقام، لە پێشوازیدا وەستابوون، کە ڕوفاتی ئەنفالکراوان گەیشتە خاکی کوردستان بە مەراسیمیٚ شکۆدارو ڕێزلێنانەوە پێشوازیان لێکرا و گوڵبارانده‌کران، شەقامەکان بە پێدەشتی گوڵزاری قەدپاڵی چیاکانی کوردستان دەچوو، فرمێسکی گەشی کوردان، تەنانەت ئەشکی منداڵە چاو گەشەکانیش، وەك ئاورینگی بەیانی بەهار بە سەر پەڕەی گوڵی سەرشەقام و ڕوفاتی پیرۆزی ئەنفالەکانەوە بوو، هەموو کوردیٚ، بە تایبەت کەسوکاری ئەنفالەکان، خۆیان بە

خاوەنی هەر تەرمێ دادەنا ودڵی ئەوانەی چەندین ساڵە لە چاوەڕوانیی چارەنووسی ئەنفلکراواندا بوو، ئەوڕۆ هێوربووەوە.
زۆربەی ڕۆژنامە نوسانی جیهان، لەو مەراسیمەدا بەشداربوون، ئەوسا جیهان زانی، ڕژێم چ کارێ نامرۆیانەی بە سەر گەلەکەمان هێناوە.
هەردوو مەزاری پیرۆزی ئەنفالکراوان، تاجە گوڵینەیان لە سەر دانرا، چەندین چەپکە گوڵی ڕێزو وەفاداری لە لایەن کوردان و تەنانەت بیانییەکانیشەوە دانرا.کارە ساتی ئەنفال، گیانی برایەتیی و تەبایی لە نێو ڕیزەکانی گەلمان پتەوترکرد، بە یەکدەنگ داوای زووتر بە جیهانناساندنی جینۆسایدبوونمان لەلایەن ڕژێمی دیکتاتۆرەوە کرا، تا لە دادگای نێو دەوڵتیش دان بە جینۆسایدی کورد بهێنری و سەربەخۆییی و ئازادی کوردستان مسۆگەرتر ببێت.

# کۆڕ

لەساڵیادی ئەنفال، ڕێگەوبانەکان زۆر جەنجاڵبوو، چونکە کوردیی ناوەوە و دەرەوەی کوردستانی گەورە، نوێنەری وڵاتان، بەرەو مەزارگەکان دەهاتن، چەپکە گوڵی وەفا و ڕێزیان بۆ قوربانیان دادەنا .لە کەناڵەکاندا ئاگادارییان بڵاوکردەوە، کۆڕێکی هۆنراوە سازدەکرێ، تایبەت بە قوربانیانی ئەنفال، هەرکەس دەیەوێ بە هۆنراوە بەشداری بکات، لە ماوەی دوو ڕۆژدا بەرهەمەکەی بنێرێت، تا لیژنەی هەڵسەنگاندن هەڵبژاردن بۆ باشترینیان بکات و بیخوێنێتەوە لە کۆڕەکەدا.

وریا وتی جاران هۆنراوەی دڵدارییت دەنووسی، ئەمجارەیان بۆچی بۆ شەهیدان نانووسی.

گوتم :ئەمشەو دەنووسم و سبەینێ تەماشای بەرهەمەکەم دەکەین.

هەر بۆ بەیانی زوو، گوتم ئەمشەو نەنووستووم، تا لە کۆتاییدا ، ئەم هۆنراوە سادەیەم لە دایك بوو.

"ئەنفال"

بە کارەساتی ئەنفال، دوژمن هەڵیڕشت قینی چەندین ساڵ

کچان و کوڕان، پیر و پەك کەوتە لەگەڵ ژن و منداڵ

سەد و هەشتا و دوو هەزار ئەنفال، لە وەرزی بەهاری ساڵ

زیندانیی كران له نوگره، تالآن كرا سەروەت و ماڵ و حاڵ
زوڵمیان زۆر لیّ دەكردن، بە تایبەت لە كچی چواردە ساڵ
باوك كچی خۆی دەكوشت ، تا نەكەویّتە دەس دوژمنی زاڵ
شۆفەڵیان چاڵی هەڵئەكەند، بە كۆمەڵ دەكران زیندەچاڵ
تیّكەڵ دەبوو، دەس و پەنجە و قاچ لەگەڵ كوڵمی ئاڵ
نەدەما دەنگ و هاوار یان، تەنانەت گڕو گاڵی منداڵ
لمی نوگرە داپۆشی، منداڵ چاو نەپروكاو تا تەمەن هەشتاساڵ
ئۆردوگابوو، چوارهەزاروپیّنجسەد دیّ كۆكردەوە لە ژیّر چاڵ
بەم كارەساتە بەدناوە ، دوژمن هەڵیرشت قینی چەندین ساڵ

له پاش خویّندنەوە، هەردووكمان بڕیارماندا شیعرەكەم بەشداری پیّبكەم لەو كۆڕە و بانگیّشتیّ ماڵی (ئەحمەد و ریّبوار و فایەق) بكەین.نازە هات گوتی مژدەیەكی، گەلاویّژخان باری دەروونی باش بووە، ئیّستەش دوو گیانە و سۆنەری كردووە، كچیان دەبیّ.
گوتم: نازە گیان جوانترین دیارییت قەرزارم...........
چووین بەرەو لیژنەی تایبەت، بۆ وەرگرتنی هۆنراوەكە و هەڵسەنگاندنی.لە پاش دوو رۆژ ناوی هۆنراوە پەسندكراوەكان دەرچوو، ناوی من پیّنجەمین ناو بوو.
ئەو ئیّوارەیە هۆڵی تایبەت بە كۆڕەكە، جەنجاڵ بوو، خەڵكانیّ زۆر هاتبوون، بە تایبەت كەسوكاری ئەنفالكراوان، مۆسیقاییّ دڵتەزیّن

پێشوازی لە میوانان دەکرد، پتر ماتەمینیی و فرمێسکی قەتیس ماوی چاوانیی دەردەخست.

دەسپێکی پرۆگرامی کۆڕەکە، بە خولەکێ وەستان بۆ گیانی پاکی شەهیدان بوو، پاش خویندنەوەی چەند ووتارێ خوێندنەوەی هۆنراوە دەسپێکرد، نۆرەم هات بانگکرام بۆ سەر سەکۆی شانۆکە.چووم بەرەو ئەو مێزەی کە بە ئالای کوردستان داپۆشرابوو، هۆنراوەکەم لە سەر مێزەکە دانا، مایکەکەم ڕێکخستە ئاستی دەم، تەماشایێ خەڵکیم کرد، چاوانیان بە فرمێسکی گەش شۆرابوو، هەر یەکێك ، وێنەی کەسێ خۆشەویستی ئەنفالکراوی وەك ملوانکێ لە مل کردبوو، سەرنجی ڕیزی پێشەوەمدا، ژنێ بە تەمەن وێنەیەکی ڕەش وسپیی لە جام گیراو، لە چوارچێوەیێ ڕەنگاوڕەنگ (زەرد، سەوز، سوور)ی هێنابوو، لە سەر دڵی دانابوو، کە لێی ووردبوومەوە وێنەکە بەو پیاوە بەساڵاچووە دەچوو لە بیابانەکە هاتبووە خەونم.دەسمکرد بە خوێندنەوەی هۆنراوەکەم، ئاوازیی مۆسیقایێ دڵتەزێن، وشە بە وشەی هۆنراوەکەی ناسك و بە سۆزتر دەکرد، گریانێ تاوی لە قوڕگمدەدا، دەنگی دەگۆڕیم ئەشك بەرچاوی دەگرتم، وشەکانی لێڵ دەکردم، جاروبار کە چاوم هەڵدەبڕی، وێنەی مامە پیرەم دەبینی، خوێندنەوەی هۆنراوەکەی بە سۆز و گوڕتر پێدەرەبڕیم، دەنگی گریەی میوانی کۆڕ، تێکەڵ بە دەنگی هۆنراوە و ئاوازی مۆسیقا کردبوو,تا هۆنراوەکەم تەواوکرد، چەند جارێ بە دەستەسڕەکەم،

ئارەقی نێوچەوانم دەسڕی، کۆتایی بە هۆنراوەکەم هات.تا گەیشتمە شوێنی دانیشتم، دەستم بە سینگەوە و سەری ڕێزم بۆ دانواندن .

کە ڕۆیشتینەوە گوتم نازە گیان، دەزانی لە کۆڕەکە سەیری سکی گەلاوێژم کرد، دڵخۆشبووم کە دوو گیانە، دڵخۆشتر بووم، کە هاتبوو بۆ کۆڕەکە و بێئەوەی باری دەروونی هیچ ئاڵۆزبێ.

نازە: وەك خۆی بۆی باسکردووم.وا بزانم لەم ڕۆژانە منداڵی دەبێ.

– گەر منداڵیان بوو، ئاهەنگێ خنجیلەی لە باخەکەمان بۆ ساز دەکەین.

هەر ئەو شەوە لە لێدانی زەنگی مۆبایلەکەم بە ئاگا هاتم، سەیری شاشەی مۆبایلەکەم کرد، ناوی ئەحمەد نووسرابوو، زۆر ترسام ئاخۆ بەم درەنگە بۆچی پێوەندیی دەکات، دەبێ کۆڕەکە باری دەروونی گەلاوێژی ئاڵۆزکردبێ، بەڵام گوتی گەر بە ئەرك نەبێ لەگەڵ (نازە خان)، وەرن وهاوکاریمان بکەن، چونکە گەلاوێژ بە ژانی منداڵبونەوەیە.

گوتم: هەر ئێستە دێین.

مۆبایلم داخست و بە (نازە)م گوت بە پەلە خۆت ئامادەکە، گەلاوێژ بە ژانی منداڵ بوونەوەیە.

ماڵی وریام تێگەیاند، (چرۆ و نازە)م برد و (وریا)م لای منداڵەکانی هەردوولا جێهێشت.

چرۆ و نازە چوونە ژووری گەلاوێژ.دایکی ئەحمەد دەیویست خۆی ببێ بە مامان، بەلاّم (نازە) گوتی:

با بە زووترین کات بیگەیەنینە نەخۆشخانەی منداڵبوون.

چووین بەرەو نەخۆشخانە، لەگەڵ خۆرهەلاّت، چرۆ هەواڵی پێداین، کچێ خنجیلەیان بووە ناوی چیی لێبنێین؟.

ئەحمەد :زۆر لە مێژە چاوەڕوانیی ئەم کچەم بێتە دونیاوە، هەر لە خۆشی (سۆز)، ناوی دەنێم (سۆز).

گوتم: پیرۆز بێ، هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازم.

گەڕاینەوە ، نازە و چرۆ، پێویستییەکانی گەلاوێژیان جێبەجێکرد و پیرۆزباییمان لێکردن و گەڕاینەوە بۆ ماڵ.

# ئاهەنگ

ڕۆژی دەسپێکردنی ئاهەنگەکە، باخە پانوبەرینەکەمان ڕازاندبووەوە، میوانیٚ زۆرمان بانگێشتکردبوو، تیپەکە پارچە مۆسیقای گۆرانی هونەرمەند مامۆستا (عەلی مەردان)، بە ناوی (گیانە بەسیەتی، دەرد و مەینەتی) پێشکەشکردین.ئەو ئاوازی مۆسیقایە کپیکردین، هەستم دەکرد، باخەکە بێشکەییٚ بوو، ئەو سۆزو ئاوازەش لایلایەی بۆ دەکردین.

پاشان گۆرانی بێژ، پیرۆزبایی لە دایکبوونی (سۆز)ی کرد، گۆرانییٚ مامۆستای هونەرمەند (حەسەن زیرەك)ی بە ناوی (کۆرپە دڵەکەم ئارەزوو) پێشکەش کردین، هێندیٚ جار، ناوی (ئارەزوو)ی دەگۆڕی بە (سۆز).

(دایك و باوکی سۆز)ی دڵخۆشتر دەکرد.دوای ئەو گۆرانییە، گۆرانی هەڵپەڕکیٚ دەسپێکرد، کپی و بێدەنگی نەما، کورسییەکان چۆڵبوون، هەموو هەستانە نێو شاییەکە، بە جۆش و خرۆشەوە هەڵدەپەڕین، (وریا) سەرچۆپی گرتبوو، جاروبار (فایەق) سەرچۆپییەکەی لێوەردەگرت.

ڕێبوار ئەحمەدی برد بۆ نێو شاییەکە و لە نێوان خۆی و وریاوە دەستیان بە هەڵپەڕکێ کرد، هێند بە توندی یەکتریان گرتبوو وپێیاندەدا بە زەوییەکەدا وەك ئەوەی چیی دەردو ئازاری ڕابردووی ناخیان هەیە بە زەوییەکەی بسپێرن وبە ناخیا بیبەن، خۆمیش جاروبار دەچووم، هەندێ جار لە خزمەت و چاودێری میوانەکاندا بووم.

چرۆ و نازە وشیرین، زۆر بە جوانی هەڵدەپەڕین، لە مێژ بوو لە ئاهەنگدا بەشدار نەبوون، بەڵام گەلاوێژ توانای نەبوو شایی بکات، سۆزی لە باوەش گرتبوو، هەر کەسێ سەیری بکردایە، بە زەردەخەنەیێ زۆر جوان وپاکوبێگەرد وەڵامی دەدانەوە.

کۆتایی بە ئاهەنگەکە هات، هەموو پیرۆزباییان کرد و دیاریان پێشکەش بە سۆز کرد، بەڵام نەمهێشت ماڵی (ئەحمەد ، ڕێبوار ، فایەق ، وریا ) بڕۆنەوە، گوتم ئەمشەو بە یادی جاران وباسکردنی بەسەرهاتەکانی ڕابردوومان ڕۆژدەکەینەوە.

ئەحمەد: زۆر سوپاسی هەموو لایێ دەکەم، کارێکتان کرد هیچ کات لە یادم نەچێ.

گەلاوێژ :ئەوەی ئێوە کردووتانە برا بۆ برای ناکات.

نازە : قسەی وا مەکە ئەوڕۆ خۆشترین ڕۆژمان بوو.

وریا: بە ڕاستی ئاهەنگێ خۆشبوو، یاخوا (سۆز) گیان هەر تەمەن درێژ بیت، بەڵام کوڕینە دەزانن ئاهەنگێ دیکەمان لە پێشە.

فایەق :گەر وەك ئەم ئاهەنگە بێت، بانگشم نەکەن دێم.

گوتم : (وریا) گیان، ئاهەنگەکە کەیە و لە کوێیە؟
گوتی : ئەوەیان لە ڕێبوار بپرسە.
هەموو پێکەنین و ڕوویان کردە ڕێبوار، ئەحمەد پێیگوت ڕێبوار پێویستە ژن بێنی، چاوەڕوانی چییتە؟
گوتم :تۆ تەنیا بڵێ ئەو کچەم دەوێ، هیچ خەمت نەبێ، هەر لەم شوێنە ئاهەنگت بۆ سازدەکەین.
گوتی:سوپاستان دەکەم، جارێ هەلێکم بۆ نەڕەخساوە تا کچێکم خۆشبوێت.
وریا :شەرم مەکە و زوو ئەو هەلە ڕێکخە، هەموو شت لە سەر ئێمە.
ڕێبوار گوتی بە قسەتان دەکەم و هەوڵی بۆ دەدەم.
وریا : براینە ، شەش حەوت ساڵ لە ئەوروپا ژیانم بە سەر برد، لە خۆشترین شوێن بووم، گەر ئارەزووم بووایە، هەموو ڕۆژ دەمتوانی لە ئاهەنگدا بەشدار بم، بەڵام غەریبی دوورە وڵات و کەسوکار، هەموو خۆشییێ لە پێشچاو دەخا، دڵ بە هیچ شتێ دانامرکێ.
گوتم: ڕاستە گوتوویانە: "شام شەکرە، وڵات شیرینترە".
ئەحمەد: هیچ شتێ ناتوانێ، باوەشی گەرمی نیشتمانی دایکت پێجێبێڵێ، تەنیا هەژاریی نەبێ.
فایەق لە قوژبنێکا بە کپی دانیشتبوو وگوێی هەڵخستبوو، لە پڕێکدا، بە توندیی هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی یاخوا کەس، دەردی هەژاریی ڕوو لە ماڵی نەکا، چونکە دەردێکی یەکجار گرانە،

پێشـینان زۆر ڕاسـتیان گوتـووه "هـەژاری کراسـێکه لـه ئـاگری جەهەننەم".

وریا : گرنگ ئەوەیه، ئەم ئازادییەی ئەوڕۆ دەسەبەر بووه، ئێمه ونەوەکانی نویٚ و داهاتوو، پارێزگاری لێبکەین، چیدی نەهێڵین دوژمنان ئەو کراسەمان لەبەر بکەن.

گوتم حەز دەکەم بەسەرهاتەکەمان بنووسمەوه و بیکەمه ڕۆمانیٚ.به ناوی (سنووورداشێك له بیابانی ئەنفالکراوانەوه).

هەموو پێیان باشبوو.

ئەحمەد گوتی بیرۆکەیی زۆر پیرۆزه، زۆریش پێویسته ئەم ڕاستییانه بدرکێنین و نەیشارینەوه...........

( کۆتایی )

به ڕاستی نیشتیمان خۆشەویست وشیرینە...

چەندین ساڵ لە ئەوروپا ژیانم بەسەربرد، لە خۆشترین شوێن بووم، دەمتوانی ڕۆژانە لە خۆشی و ئاهەنگ وسەیراندا بم، بەڵام غوربەتی ونامۆیی دووره وڵات و کەسوکار، هەموو خۆشییەکت لە پێشچاو دەخات دڵ، بە هیچ شتێك داناکەوێ و دانامرکێ، ( تەنیا باوەشی گەرمی نیشتیمانی دایك نەبێت ) جێهێشتنی ئەم باوەشە گەرمەش تەنیا هەژارییە ...

دیزاین: ئارام عوسمان